ناوی کتێب: مشتومڕ لەگەڵ مێژوو
ئۆلیڤەر ڕاو
نووسینی: هاری کریسلەر
و. لە ئینگلیزییەوە: عەزیز ڕەئووف
بابەت: فەلسەفە
مۆنتاژی کۆمپیوتەر: بەختیار ئەورەحمان
هەڵەچنی: نیشتمان محەمەد
تیراژ: ٦٠٠ دانە
نرخ:
ژمارەی سپاردن: (١٠٣٧)
چاپخانەی: دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
چاپی: یەکەم ساڵی ٢٠٠٩
کوردستان - سلێمانی

www.serdam.net
www.serdam.info
www.serdam.org

سەرچاوە:

Conversation with history, debate with Oliver Roy .Harry Kreisler, University of California press.2007




هاری کریسلەر

# مشتومڕ لەگەڵ مێژوو
# ئۆلیڤەر ڕاو

و. لە ئینگلیزییەوە: عەزیز ڕەئووف

سلێمانی - ٢٠٠٩

# ناوەڕۆك

# پێشەکی

کارکردن لەسەر ئیسلامی سیاسی وەك کێڵگەیەکی زانستی مێژوویەکی درێژی هەیمەنەداری نییە. پێش حەفتاو هەشتاکان، بەدەگمەن کتێبێکی زانستیمان لەسەر ئەم دیاردە سیاسی-ئایینی-کۆمەڵایەتییە دەستدەکەوێت. پێش ئەم مێژووە، ئەوەی لەسەر ئەم دیاردەیە دەنووسرا، زیاتر کۆمەڵێك دەقی ئایدۆلۆژی بوونو لەپێناوی ململانێی سیاسیو بردنەوەو دۆڕاندنەکاندا بەرهەم دەهێنران. بەڵام لە حەفتاکانو هەشتاکانەوە چەندین توێژەری زانستی لەسەر ئاستی جیهان خۆیان یەکلاییدەکەنەوە بۆ توێژینەوەو تێگەیشتنو پاشان بەرهەمهێنانی زانستێکی بابەتیانە لەسەر ئەم دیاردەیە. یەکێك لەو توێژەرانە، پرۆفیسۆر ئۆلیڤەر روایە.

ئۆلیڤەر ڕوا، کە زیاتر چوار ساڵە لە نزیکەوە دەیناسمو دوا

ساڵی ماستەرەکەمی، لەگەڵ پرۆفیسۆر فەرهاد کوسرەو کەڤاردا، سەرپەرشتیکردووەو ئێستاش بۆ ماوەی 3 ساڵ دەچێت سەرپەرشتی نامەی دوکتۆراکەم دەکات، لە ئێستادا وەك یەکێك لە قوتابخانە باڵاکان لەسەر ئیسلامی سیاسی لە جیهاندا دەخرێتە سەر شانۆو لە واقیعیشدا وایە. بابەتیبوونی ئەو زانستەی کە لەسەر ئەم دیاردەیە بەرهەمی دەهێنێت وایلێکردووە کە لە یەککاتداو بەردەوام لەلایەن تاران‌و واشنتۆنەوە، دیمەشق‌و پاریسەوە، رامەڵاو غەززەوە، ریازو لەندەنەوە، بانگهێشتبکرێت‌و لەسەر ئاستی لوتکەکاندا گوێی لێبگیرێت‌و کتێبەکانی بۆ دەیان زمان وەربگێردرێت.

لەم چاوپێکەوتنەدا، کە برامان کاك عەزیز رەئــووف لە ئینگلیزییەوە کردوویەتی بە کوردی، ئۆلیڤەر روا دەگەرێتەوە سەر کارگە زانستییەکەی‌و باس لە بەشێك لە کەرەستەو میتۆدو بوارەکانی کارکردنی دەکات. بەڵام پێمباشە، با بەشێوەیەکی خێراش بێت، لەم پێشەکییەدا ئاماژە بەچەند کۆنسێپتێکی سەرەکی ئۆلیڤەر روا بدەم کە بەبێ تێگەیشتن لێیان ناتوانین تێبگەین لەوەی کە ئەو دەیەوێت پێمانبلێت.

# ئیسلامیسم

لە تێگەیشتنی ئۆلیڤەر ڕوادا ئیسلامیسم بریتییە لە پڕۆژەیەکی ئایدۆلۆژیای سیاسی کە تەواوی "کۆمەڵایەتی/سۆسیال" لە گۆشەنیگا سیاسییەکانەوە دەبینێتو مامەڵەیان لەگەڵدا دەکاتو چارەسەر بۆ گرفتەکانیان دەدۆزێتەوە. لێرەوە، ئیسلامیستەکان توانیویانە بە وردترین شێوە کەڵك لە مارکسیسم، چ وەك ئایدۆلۆژیاو چ وەك ڕێکخراو، وەربگرن.

ئەم ئیسلامیسمە مێژوویەکی هەزار ساڵەی نییە، بەڵکو لە بیستەکانی سەدەی ڕابوردوداو لەژێر دەستی چەند پیاوێکی وەك حەسەن بەنناو مەودودیو خومەینیو موحەمەد باقر سەدرو موحەمەد فەزلولڵاو سەید قوتبو ...هتد دا دروستدەبێت. ڕاستە ئەم ئەکتەرانە دابەشدەبن بەسەر هەردوو گەردوونی شیعەو سووننەدا، بەڵام

ئەوەش راستە کە گوزەرو بازبازێنێکی ئایدۆلۆژی بەردەوام هەبووەو هەیە لەنێوانیاندا. هەموو ئەمانە لەسەر ئەو بنەمایە هاودەنگبوون کە دەکرێت ئیسلام وەك ئایدۆلۆژیایەکی سیاسی بخرێتە سەر شانۆو بەدەرەوە بناسێنرێت‌و لەهەمانکاتدا دەکرێت لەسەر بناغەی ئەم ئایدۆلۆژییە سیاسییە ئەو شتە پیرۆزە دروستبکرێت کە ناوی "دەوڵەت"ە. واتە دەوڵەت دڵە زیندووەکەی ئیسلامیسمەو لەپێناوی بیناکردنیدا دروستبووە.

ئەمە مانای ئەوەنییە کە ئەوان بە سروشتی خۆیان چەند ئەکتەرێکی شۆڕشگێڕن‌و تەنها کار لەسەر کۆدێتا دەکەن‌و هەمیشە پەلاماری چەك‌و زەبروزەنگ دەدەن. راستە ئیمام خومەینی، هەر لە ساڵی 1963وە، وروژێنەری ململانێیەکی چەکدارانە بوو، بەڵام ئەوەش راستە کە حەسەن بەننا، وەك ئۆلیڤەر روا دەڵێت، هەرگیز خاوەنی تیۆرییەکی تایبەت بە شۆڕشی چەکداری نەبووە. تەنانەت مەودودیش خاوەنی ئەو جۆرە لە تیۆری نەبووە. ئەو ئەکتەرە سیاسیانە هەمیشە هەوڵیانداوە لەنێو هەلومەرجەکانی ئێستاو ئێرەدا کاربکەن‌و ئەو فاکتەرەی کە پەیوەندییەکانی ئەوانی لەنێو کۆنتێکستە جیاوازەکاندا دەستنیشانکردووە تەنها بەرژەوەندییەکان بووە نەك شتێکی دیکە. بۆنموونە:

گەر پێیانوابووایە کە لەرێگای هەڵبژاردنەوە دەگەنە کورسی دەسەڵات، ئەوا رێگای هەڵبژاردنیان دەگرتە بەر. هەروەها گەر پێیانوابووایە لەرێگای دەستخستنە دەستی نەیارەکانی دەسەڵاتەوە دەگەنە سەر هەمان کورسی، ئەوە زۆر بە ئاسانی دەستیان دەخستە نێو دەستیانەوە. واتە ئەوان ئامادەبوون لەسەر هەموو پەتەکان یاری

بکەن. برایانی موسوڵمان لە میسر پێشنیاری هاوپەیمانێتییان کرد بۆ جەمال عەبدولناسر، بەڵام ئەو ئامادەنەبوو وەك هاوپەیمان قبوڵیان بکات.

لێرەوە دەکرێت بڵێین ئیسلامیستەکان لە چوارچێوەیەکی روتوقوتی سیاسیانەدا ئیسلام دەبینن‌و لەنێو ئەم چوارچێوەیەشدا چەمکی دەزگاو بە دەزگاییکردن‌و بە دەزگاییبوون روبەرێکی گەورە داگیردەکات‌و هەر لێرەشەوەیە کە گوزارشتی دەوڵەتی ئیسلامی لە دایکدەبێت. هەموو ئیسلامیستەکان هاودەنگن لەسەر ئەوەی کە ئەم دەوڵەتە دەبێت سەرۆکێکی هەبێت‌و ئەنجومەنی‌وەزیران‌و هەموو دەزگاکانی دیکەی هەبێت. واتە باوەریان بە دامەزراندنی دەوڵەتێکە بە هەموو دەزگاکانی تەشریعی"و "تەنفیزی"و "قەزائی"یەوە.

لەسەر ئاستی ئایدۆلۆژیاو بە شێوەیەکی تیۆری، ئیسلامیستەکان بریتین لەو ئەکتەرانەی کە شووناسی ناسیۆنال تێدەپەرێنن‌و پێیانوایە دەوڵەتی-نەتەوە دروستکراوێکی رۆژئاواییەو موسوڵمان نابێت وەك ئامانجێکی هەمیشەیی قبوڵیبکات، چونکە ئامانجی ئەو بریتییە لە بیناکردنەوەی ئوممەی ئیسلامی. هەر ئەمەشە کە وایکردووە، بەپێی دەستوری ئێرانی، مەرج نییە رابەر ئێرانی بێت، چونکە بەتەنها رابەری ئێرانییەکان نییە، بەڵکو رابەری هەموو موسوڵمانانی جیهانە.

ئەمە لەسەر ئاستی تیۆری، بەڵام لەسەر ئاستی پراکتیك داتاکان دەگۆرێن. برایانی موسوڵمان کە گەورەترین رێکخراوای ئیسلامیستی جیهانین، هەر لە سەرەتاکانی دروستبوونیانەوە، لەهەر وڵاتێکدا لقی تایبەتیان هەبووەو بەتەواوی لەژێر کارایی گرەوە ناوخۆییەکاندا بوون‌و

لە کۆتاییشدا هەموویان لەنێو کێڵگە سیاسییە نیشتمانییەکاندا تواونەتەوەو بوون بە بەشێك لە ستراتیژی نیشتمانی. یەکگرتووی ئیسلامی کوردوستان باشترین نموونەیە. لە ئێستادا یەکگرتوو تەنها لەنێو چوارچێوە گشتییەکانی کێڵگەی سیاسی کوردیدا بەرژەوەندیو ستراتیژو گرەوەکانی دەستنیشاندەکاتو هەزار تاریق هاشمی ناتوانێت بریارێکی پێچەوانەی کێڵگەی سیاسی کوردی بە سەلاحەدین بەهادین بدات.

ئەمرۆو پاش شکستی پرۆژەی ئیسلامیسم کە بریتیبوو لە دروستکردنی دەوڵەتی ئیسلامی، ئیسلامیستەکان ئیتر گرفتی سەرەکی نین، بەڵکو هەندێك جار دەبن بە گرفت بۆ خۆیان. گەر ئیسلامیسمی کوردی پێش شکست هەمیشە گرفتبووبێت بۆ کێڵگەی سیاسی کوردی، ئەوا ئەمرۆ خۆی بووە بە گرفت بۆ خۆی. لێرەدا خوێندنەوەیەکی بابەتیانەی پەیوەندییەکانی نێوان بزووتنەوە/ کۆمەڵ یاخود کۆمەڵ/ یەکگرتوو کارێکی بێهودەنابێت، چونکە دەمانباتەوە سەر ئەم گریمانەیە. ئێستا ئەوەندەی بزووتنەوە گرفتە بۆ کۆمەڵ، ئەوەندە گرفت نییە بۆ یەکێتی، هەروەها پێچەوانەکەشی راستە. لە تورکیای ئەمرۆدا، ئیسلامیستەکان نەك هەر گرفتی سەرەکی نین بۆ کێڵگەی سیاسی، بەڵکو یارمەتیدەرێکی بەردەوامن بۆ سیڤیلیزەکردنیو دوورخستنەوەی لە هەیمەنەی ژەنەراڵەکان. گەر تائێستاش برایانی موسوڵمان گرفتێکی سەرەکین بۆ کێڵگەی سیاسی میسری، لەبەر ئەوەیە کە دەسەڵاتێکی دیکتاتۆر، کە زیاتر لە 30 ساڵە حکومدەکات، ئەم وڵاتە دەبات بەرێوەو ئامادە نییە بنەما دیموکراتییەکان بسەلمێنێت.

شکستی ئیسلامی سیاسی مانای کۆتاییهاتنی ئەکتەرە ئیسلامیستەکان نییە، بە پێچەوانەوە، ئەوان هەمیشە لێرەن، ئەوەی گـۆڕاوە دڵی پرۆژەکەیانە. واتە دەستهەڵگرتنیانە لە بیناکردنی دەوڵەتێکی ئیسلامی جیهانیو توانەوەیانە لەنێو فاکتە نیشتمانییەکاندا. حەماس لە فەلەستین، حیزبوڵڵا لە لوبنان، بەرەی ڕزگاری خوازی ئیسلامی لە جەزائیر، AKP لە تورکیا، حیزبی ئیسلامی لە عێراق، نەهزە لە تونس، تورابی لە سودان، جەماعەی ئیسلامی لە پاکستان، هتد. هەموو ئەمانە بۆیەکجاری لە ئاسمانی ئوممەوە دابەزینە سەر زەمینی نیشتمانو تەنها لە چوارچێوەی نیشتمانێکدا کاردەکەن.

# فۆندامۆنتالیسم

ئۆلیڤەر ڕوا لە کتێبی "لایسیتێ لە بەرامبەر ئیسلام" دا بە درێژی دەگەڕێتەوە سەر چەمکی فۆندامۆنتالیسمو لە بەرامبەر چەمکی ئیسلامیسمدا دایدەنێت. فۆندامۆنتالیستەکان پێیانوایە ، کۆمەڵگەیەك تەنها ئەو کاتە دەبێت بە ئیسلامی، کە هەموو ئەندامەکانی ببن بە موسوڵمانی "چاك". گەر هەموو ئەندامانی ئەو کۆمەڵگەیە پابەندبن بە ئیسلامەوە، وەك ئەوەی کە خودی ئیسلام داوایکردووە، گەر هەموو پانتاییەکانی ژیانی تاك ئیسلامی بێت :

پانتاییماڵەوە، پانتایی کار، پانتایی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، پانتایی پەیوەندییە ئابورییەکان، ئیتر خودی ئەو کۆمەڵگەیە دەکرێت کارەکتەری ئیسلامیست وەربگرێت. فۆندامۆنتالیستەکان هەموو تواناکانیان ئاراستەی دەوڵەت ناکەنو دەوڵەت ناکەن بە ناوەندی هەموو کردەو چالاکییەکانیان. گەر دەوڵەت بتوانێت لەم پرۆسێسەدا یارمەتیدەربێتو هاوکاری کردەی ئیسلامیزاسیۆنی کۆمەڵگە بکات، ئەوە زۆر باشە، گەرنا لە خراپترین حاڵەتدا وەك گرفتێك تەماشادەکرێت، گرفتێك کە روناکییەکی زۆری ناخرێتە سەر. ئەمەش بەپێچەوانەی ئیسلامیستەکانەوە کە گوتارو پراکتیکەکانیان راستەوخۆ دەوڵەت دەپێکێت، گوتارو پراکتیکی فۆندامۆنتالیستەکان راستەوخۆ ئاراستەی کۆمەڵگە دەکرێتو کۆمەڵگەش وەك کۆمینۆتێی باوەردارەکان پێناسەدەکاتو دەیخاتە سەر شانۆ. بەڵام ئایا ئەمە مانای ئەوەیە کە ئەوان داواکاریی سیاسییان نییە ؟ بێگومان نەخێر، چونکە ئەوان بەردەوام کاردەکەن بۆ جێبەجێکردنی شەریعەت.

بە سنووری ئەوەی کە ئیسلامیستەکان کاردەکەن لەسەر هەبوونی دەستوورو جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکانی "تەشریعی"و "تەنفیزی"و "قەزائی"، بە هەمان سنوور فۆندامۆنتالیستەکان ئەم جۆرە پرسیارانە لەخۆیان ناکەنو بوونو نەبوونی دەستوور لە وڵاتێکدا ناکەن بە ئیشکالیەتی کارکردنیان، ئەوان نەك هەر نایانەوێت ئەو دەسەڵاتانە لەیەکجیابکرێتەوە، بەڵکو لە بناغەوە نایانەوێت هەشبێت.

بە سنووری ئاڵۆزیی فیکری ئیسلامیستەکان لەسەر جیهانی کۆمەڵایەتیو سیاسی، لەسەر دیمۆکراسی، لەسەر دەسەڵات، فیکری فۆندامۆنتالیستەکان سادەو بێ گیروگرفتو بێ ماندووبوونە.

بۆنموونە، فۆندامۆنتالیستەکان پێیانوایە، ئەو چرکەیەی کە شەریعەت لە کۆمەڵگەیەکدا جێبەجێدەکرێت ئیدی ڕاستەوخۆو بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی دادپەروەری کۆمەڵایەتی دەچەسپێتو ژیان دەبێت بە بەهەشتو گورگو مەڕ پێکەوە ئاودەخۆنەوە.

لە جیهانبینی ئیسلامیستەکاندا، ڕۆژئاوا هەمیشە ئەو دوژمنەیە کە دەبێت لەناوببرێت، ئیتر لەسەر ئاستی جەستەیی بێت یان لەسەر ئاستی کولتوری. بەڵام فۆندامۆنتالیستەکان بە پێچەوانەوە، ڕۆژئاوا هەمیشە بە"ئەویتر" دەزانن، ئەویترێك کە لە ئێمە جیایەو پێویست ناکات بیکەین بە ناوەندی گوتارو پراکتیکی خۆمان. کاتێك ئێمە دەتوانین کۆمەڵگەیەکی ئیسلامی ئیدیال لەسەر شەریعەت دروستبکەین، ئیتر ڕۆژئاوا، لەژێر کاراییی ئەم ئیدیالەدا، فەوج فەوج دێنە نێو دینی خواوە، ئەگەر موسوڵمانیش نەبن، ئەوە دەتوانن، وەك جولەکەو مەسیحی بمێننەوەو لە سێبەری سیستەمە کۆمەڵایەتییە دادپەروەرەکەی کۆمەڵگەی ئیسلامیدا بژین.

ئەمەش دەمانباتەوە سەر داتایەکی زۆر گرنگ. ئیسلامیستەکان، وەك نازیەکانی ئەڵمانیا ئەنتی-سامینو وەك جاکۆبینیستەکانی فەرەنسا ئەنتی-مەسیحین، بەڵام فۆندامۆنتالیستەکان تەواو بە پێچەوانەوە، نە ئەنتی-سامین نە ئەنتی-مەسیحیشو ئەو دوو کۆمینۆتێیە وەك "کلکی" کۆلۆنیالیسم نابینن. لەو کۆمەڵگە ئیدیالەی کە ئەوان باسیدەکەن، جولەکەو مەسیحیو موسوڵمان دەتوانن پێکەوە بژین.

گەرهەموو ئەمدیوارانەی کەلەنێوان ئیسلامیسم و فۆندامۆنتالیسمدا هەن، پەراوێزبخرێن، بێگومان ئیتر زۆر ئاسانە هەردوو کاتیگۆریەکە

فڕێبدەینە نێو بتلێکەوە. یەکێك لەو "خوێنەوارە" کوردانەی کە لە کوردوستان سەردانیکردم، پێیوابوو کە ئیسلامیسمو فۆنداmۆنتالیسم وەك شەکرو چا وانو هەمیشە لە پیاڵەیەکدا بەیەکەوە دەخورێنەوە. بەڵام من پێموایە گەر ئەم دوانە لە پیاڵەیەکدا تێکەڵ بەیەکتری بکەین، ئەوەندە تاڵدەبن کە هیچ ئەفغانییەکیش، کە زۆر ناسراون بە چاخواردنەوە، نەتوانێت بیخواتەوە. جیاوازی نێوان ئیسلامیسمو فۆندامۆنتالیسم، جیاوازی نێوان سەرۆکی یەکێتی زانایانی ئیسلامی کوردوستانو ئەمینداری گشتی یەکگرتووی ئیسلامی کوردوستانە. پێموایە ئەو توێژەرەی کە ڕێز لە بنەما زانستییەکان بگرێت هەرگیز ناتوانێت یەکێتی زانایانو یەکگرتووی ئیسلامی وەك چاو شەکری نێو پیاڵەیەك تەماشا بکات.

# نیۆ-فۆندامۆنتالیسم

ئۆلیڤەر ڕوا پێیوایە کە، نیۆ-فۆندامۆنتالیسم ئەو چەمکەیە کە لە چوارچێوەکەیدا، هەموو ئەو ئەکتەرە یاخیانەی کە پاش ئاساییکردنەوەی ئیسلامیسم سەریانهەڵدا، جێگایاندەبێتەوە. تەواو بە پێچەوانەی هەموو ئەو تیۆریانەی کە دەیانەوێت سەرهەڵدانی ئەم

ئەکتەرانە ببەستنەوە بە هەلومەرجێکی ئابوری سەختەوە، توێژینەوە بایەخدارە بابەتییەکان بۆمان دەردەخەن کە ئەو ئەکتەرانە بریتینین لە جوتیارو کرێکارو چەوساوەو ڕەشوروتو پەراوێزخراوەکانی کۆمەڵگە، بەڵکو ئەوان منالی شەرعی مۆدێرنیتێنو لە قولایی شارەکانو زانکۆکانو ناوەندە گرنگە ئابوریو کۆمەلایەتیو سەربازیو زانستییەکانەوە دێنە دەرەوە. لە کوردوستانی ئەمرۆدا چەندین ڕۆشنبیر دەیانەوێت ئەم ئەکتەرانە ببەستنەوە بە تیۆرییە سۆسیۆلۆژییەکان لەسەر هەژاریو هەلومەرجی ئابوری سەختەوە، بەلام لە واقیعدا، هیچ یەکێك لەو تیۆریانە توانای ئەوەی نییە بابەتیانە لەم دیاردە نوێیە تێبگات.

بزوتنەوەی نیۆ-فۆندامۆنتالیسم سەرەتا لە زانکۆکانەوە دەستپێدەکاتو خوێندکارانی زانکۆکان وەك پۆلی یەکەمی ململانێکانی مۆبیلیزە دەکات. بەشێکی زۆری ئەم خوێندکارانەش سەر بە چینی ناوەراستی کۆمەڵگەکانن. ئەمە مانای ئەوەنییە کە لەریزی نیۆ-فۆندامۆنتالیستەکاندا، منالانی خواری خوارەوەی کۆمەڵگە نابینین، بە پێچەوانەوە دەیانبینین، بەلام هەمیشە وەك بەکارهێنراوێك لەلایەن ئەکتەرە کاراکانەوەو زۆر بەدەگمەن یەکێك لەوان دەبێت بە خاوەنی پێگەیەکی بەهێز لە سەنتەری ئەو بزوتنەوەیەدا.

ئەو پانتاییەی کە ئیسلامیستەکان بەجێیان هێشت، ئێستا نیۆ-فۆندامۆنتالیستەکان بەوپەری ئازادییەوە ئەسپی تیادا تاودەدەن. مەبەست لە پانتایی هەموو ئەوانەیە کە دەوڵەتی-نەتەوەیان نییە، یاخود ناتوانن بن بە خاوەنی ناسیۆنالیتێیەك، خاکێك، نیشتمانێك. ئەمەش، وەك ئۆلیڤەر ڕوا دەڵێت، دوو هۆکاری سەرەکی هەیە :

هۆکاری ئایدۆلۆژیو هۆکاری نەبوونی جنسیە. وەك ئەو دەڵێت، بن لادن، لەبەر چەندین هۆکاری ئایدۆلۆژی، ناتوانێت خۆی بە سعودی بزانێت، چونکە عەرەبی سعودی ولاتی سعودییەکانە، واتە ئەوانەی سەر بە سعودن، کە لە بناغەدا هۆزێکی ئەو ناوچەیەن. لەم ولاتەدا تۆ بە سنووری دووریو نزیکیت لەم خێڵەوە بوونو ئەرزشت هەیەو ڕێگای ژیانت پێدەدرێت. ڕاستە بنەماڵەکەی بن لادن، بە نزیکبوونەوەیان لەم خێڵە، بوون بە یەکێك لە ملیاردێرەکانی جیهان، بەڵام ئەوەش ڕاستە کە بن لادن، لەبەر چەند هۆیەکی ئایدۆلۆژی تایبەت، خۆی بە سعودی نازانێتو لەسەر ئاستێکی دیکەی فراوانتر بیردەکاتەوە.

ئێمە پێمانوایە، ئەم ڕەگەزە بەشدارییەکی زیندووی هەیە لە بیناکردنی تیرۆریسمی ئەلقاعیدەدا. ئەو ئەکتەرە تیرۆریستانەی کە 11 ی سێپتەمبەری 2001 یان دروستکرد، زۆربەی زۆریان لە عەرەبی سعودیەوە هاتبوون. واتە یاخیبوون لە بنەماڵەی سعودو نیشتمانی ئالی سعود. ڕەتکردنەوەی دەوڵەتی بنەماڵەی سعود لەلایەن بن لادنو ئەکتەرەکانی دیکەوە بەڵگەیەکی زیندووە لەسەر مۆدێرنیتێیان.

بەشێکی دیکەی ئەکتەرە نیۆ-فۆندامۆنتالیستەکان ئەوانەن کە بێ-جنسیەن، بێ-ئەوراقن. ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەرفراوانترین ڕووبەرە لە جیهاندا کە زۆرترین ژمارەی مرۆڤی بێ جنسیەو بێ ئەوراقی لەسەر دەژی. لەزۆربەی ئەم ولاتانەدا، هەموو یاساکان لەسەر جنسیە پێبەخشین یان ئەوراق دان بە کەسێك، بە شێوەیەکی تەواو ڕاسیستانە بیناکراونو دارێژراون. لە ولاتێکی وەك کوێت دا، کەسێك کە بەرەگەز کوێتی نەبێت هەرگیز ناتوانێت ببێت بەخاوەنی جنسیە.

کۆچەری واهەیە کە شەست ساڵە لەم وڵاتەدا دەژی، واتە نزیکەی چوار وەچەیە لەم وڵاتەدا دەژی، بەڵام مافی ئەوەی نییە کە ببێت بەخاوەنی ناسیۆنالیتێی کوێتی. لە سوریادا هەزاران هەزار هاووڵاتی هەن کە مافی ئەوەیان نییە ببن بەخاوەنی جنسیەو پاسپۆرتێکی سوری، تەنها لەبەر ئەوەی بەرەگەز کوردن نزیکەی چارەکە سەدەیەکە. لە ئێراندا ، زیاتر لەیەك ملیۆن ئەفغانیو کوردی ئاوارە دەژین، بەڵام ناتوانن ببن بەخاوەنی ناسیۆنالیتێی ئێرانی.

ئەم پانتاییە مەیدانێکی زۆر بایەخدارە بۆ ئەوەی بن لادنو نیۆ-فۆنداامۆنتالیستەکان بتوانن کامیکازەکانی داهاتوویانی تیادا پەروەردە بکەن. بێ جنسیەکان، زیاتر لەهەموو ئەکتەرە کۆمەڵایەتییەکانی دیکە، شانسی ئەوەیان هەیە کە لەلایەن نیۆ-فۆندامۆنتالیسمەوە راوبکرێن. ئەکتەری بێ جنسیە کەسێکی بێ نیشتمانە، کەسێکی بێ سنوورە، کەسێکە لە هەموو شوێنێکەو لەهیچ شوێنێکیش نییە. ئەمجۆرە کەسانە بە باشترین شێوەو خێراترین کات دەتوانن چوارچێوە ئایدۆلۆژییەکەی ئەلقاعیدە دەستەمۆبکەن. دەکرێت لێرەدا نموونە بە یوسف رەمزی بهێنینەوە. ئەم پیاوە لەساڵی 1993و بۆ یەکەم جار پەلاماری World Trade Center لە نیۆیۆرك دەدات. باوکی پاکستانییە، دایکی فەلەستینییە، لە کوێت لە دایکدەبێتو خاوەنی پاسپۆرتێکی یەمەنییە. لە ئەفغانستانو دواتر لە فلیپینو پاشان لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا "جیهاد" دەکات. ئەم کاتیگۆریە لە ئەکتەری کۆمەڵایەتی ناتوانن ببن بە ئەندام لە گروپێکی ئیسلامێتی وەك برایانی موسوڵماندا، چونکە گروپێکی ئیسلامین، خاوەنی چەند نۆرمێکی تایبەتو چەند سنوورێکی تایبەتەو هەموو لایەکی

پێوەپابەند دەکات. پرسیاری سەرەکی ئەم کاتیگۆریەش بریتییە لە چۆنییەتی هەڵهاتن لە هەموو سنوورەکان نەك چۆنییەتی دامەزراندنو پارێزگاریکردن لێیان.

هەروەها کاتیگۆریەکی تر کە لەژێر گوتارەکانی بن لادنو ئەلقاعیدەدا رێگای نیۆ-فۆندامۆنتالیسم هەڵدەبژێرن، ئەو ئەکتەرانەن کە خۆیان وەك هەڵگری گوتاری " born again Muslim " دەخەنە سەر شانۆ. بەشێکی زۆر لەو ئەکتەرە کۆمەڵایەتیانە ئەوانەن کە یان لە رۆژئاوا لە دایکبوون یان لە رۆژئاوا خوێندنیان تەواوکردووەو لە دابڕانێکی قوڵدان لەگەڵ خێزانو خاكو ترادیسیۆنو وڵاتە ئەسڵییەکانیاندا. ئەم دابڕانە هەنگاوێکی زۆر پێویستە بۆ ئەوەی بتوانن لەگەڵ گوتاری رادیکالیزاسیۆنو ئیسلامی بێ سنووری ئەلقاعیدەدا یەکبگرنەوە.

عادل باخەوان
17 ئۆکتۆبەر 2008
پاریس

# باکگراوند

ئۆلیڤەر ڕوا پرۆفیسۆرە لە خوێندنی باڵای زانستە سیاسییەکان لە پاریس. ئەو یەکێکە لە پێشەنگی ئەو نووسەرانەی کە لە بواری ئیسلامدا شارەزاییان هەیە. ئەو نووسەری چەندین کتێبی دانسقەیە لەوانە: "ئیسلامی بە جیهانیکراو"، "شکستی ئیسلامی سیاسی" و "بنیادنانی نەتەوەکان".

کریسلەر:

مستەر ئۆلیڤەر بەخێربێی بۆ بێرکلی

ئۆلیڤەر ڕوا:

سوپاس

کریسلەر:

لە سەرەتادا دەپرسم لە کوێ لە دایك بویت و گەورە بویت؟

ئۆلیڤەر ڕوا:

من لە " La Rochelle " ی فەرەنسا لە دایك بووم، لە کەناری ئەتڵەنتیك، لە ساڵی ١٩٤٩.

کریسلەر:

گەر بگەڕێینەوە بۆ سەردەمی منداڵی، دایــك و باوکت چ کاریگەرییەکیان لەسەر کارەکتەری تۆ هەبوو؟

ئۆلیڤەر ڕوا:

خۆشبەختانە، دایك و باوکم لە زمانی ئینگلیزی نەدەگەیشتن، بۆیە ئەوان گرنگییان بە ئینگلیزەکان نەدەدا. لەڕاستیدا، من لە خێزانێکی پرۆتستانتی گەورە بووم، کە کەمینەیەکن لە فەرەنسا. لەبەر ئەوە باپیریشم لەگەڵمان دەژیا، ئەو قەشەیەکی پرۆتستانتی بوو لە " La Rochelle ". بۆیە دەتوانم بڵێم من لە خێزانێکی تەقلیدی پرۆتیستانتیزمی فەرەنسی گەورە بووم، کە گرنگی دەدرا بە شتە لۆجیکییەکان و لە هەمانکاتدا مۆراڵێك لە زەبروزەنگ.

کریسلەر:

تۆ ئەو کتێبانەت لەبیرە کە لە سەردەمی گەنجێتیدا دەتخوێندنەوە؟ وە کاریگەری ئەو کتێبانە لەسەرت چی بوو، بەتایبەت پێش ئەوەی بچیتە کۆلێژ؟

ئۆلیڤەر ڕوا:

من بایبڵ "کتێبی پیرۆزی مەسیح"م دەخوێندەوە، نەك لە ماڵ، بەڵکو لە قوتابخانەی ئایینی ڕۆژی پیرۆزی شەممە. من کتێبگەلێکی زۆرم خوێندەوە، کە زۆرێك لەو کتێبانە لەو سەردەمەدا بۆ گەنج سودمەند نەبوون. چەندین چیرۆکم سەبارەت بە گەشت و گەڕان دەخوێندەوە. بۆ نمونە کتێبێکی جۆزیف کاسێڵ سەبارەت بە ئەفغانستان. چیرۆکی گەشتە پڕ لە پەرجووەکان زۆر کاریگەرییان لەسەرم هەبوو.

کریسلەر:

دیدگای تۆ فراوان بوو، تەنانەت ئەو کاتەی کە گەنج بویت.

ئۆلیڤەر ڕوا:

بەڵێ، بەڵێ.

کریسلەر:

جیهان بریتی بوو لە دیدگاکانت.

ئۆلیڤەر ڕوا:

بەڵێ. ئەو نمونە سادانەی گەشت لە چیرۆکەکاندا سیحرێکی گەورەیان

پێدەبەخشیم.

کریسلەر:

لە کوێ دەستت کرد بە خوێندن؟

ئۆلیڤەر ڕوا:

خوێندنی من هەر لە " La Rochelle " بوو. کاتێك کە خوێندنی ئامادەییم تەواو کرد چووم بۆ پاریس بۆ قوتابخانەی بالآ لە بواری زانستی مرۆڤایەتیدا.

کریسلەر:

زانکۆ چ شتێکی گەورەی بە تۆ بەخشی؟ لێکۆڵینەوەکەت لە سەر چی بوو؟

ئۆلیڤەر ڕوا:

کاری من بریتی بوو لە فەلسەفە. یەکەمین کتێبم بریتی بوو لە نامەی ماستەرەکەم سەبارەت بە سیستەمی بەڕێوەبردن. تێزەکەم بریتی بوو لە زمان و پێگەی جوگرافی وڵاتی سین. لەبەر ئەوە، لەو کاتەدا خەونی ئەوەم هەبوو کە لە هەردوو بواری جوگرافی و ڕوناکبیریدا شارەزایی پەیدا بکەم.

کریسلەر:

تۆ لە شەستەکاندا لە کوێ خوێندکار بویت؟ شۆڕشە خوێندکارییەکەی

پاریس چ کاریگەرییەکی لەسەرت هەبوو؟

ئۆلیڤەر ڕوا:

من لە پاریس لە قوتابخانەی باڵا لە " Lycée de Louis LeGrand " خۆم ناونووس کرد، ئەو قوتابخانەیە سەنتەری گرنگیدان بوو بە لاتینی. لەبەر ئەوە ئەو سەردەمە جموجوڵێکی سیاسی فراوان لە ئارادابوو. زۆربەی خوێندکارەکان لە بەشی ناوخۆیی، بیروباوەڕی چەپیان هەبوو. بۆ زیاتر پراکتیزەکردنی بیروباوەڕی چەپ، ئێمە دوو ساڵ بوو لە پاریس ببووین بە ماویست. ماوەی چەند مانگێك خۆپیشاندانی خوێندکاران دژ بە پۆلیسی ئەو وڵاتە دەستی پێکرد. بێگومان خۆپیشاندانەکە دژ بە ئەمریکییەکان بوو. ئێمە جارێك پەنجەرەکانی ئوتێل "میڵتۆن"مان شکاند.

کریسلەر:

تەوەرەکە بە ئاراستەیەکی تردا دەبەم، چی وایلێکردی لە نووسینەکانتدا گرنگی بە ئیسلام و دەوڵەتە ئیسلامییەکان بدەیت؟

ئۆلیڤەر ڕوا:

لە ساڵی ١٩٦٨ ئەو کاتەی من وەك سەربازێك لە گروپە چەپڕەوەکان کارم دەکرد، نەخشەی ئەوەم دانا کە بۆ ئەفغانستان سەفەر بکەم، ئەمەش لەبەر چەند هۆیەکی جیاواز. ئەوە خەونێك بوو، خەونی منداڵیم بوو. هەموو ئێوارەیەك یەك کاتژمێر بۆ فێربوونی زمانی فارسی، کاتەکانی خۆم تەرخان دەکرد، لە کتێبێکی ئینگلیزی

بەناونیشانی "خۆت فێری فارسی بکە". بێ ئەوەی هیچ زانیارییەکم لە زمانی فارسیدا هەبێت، خۆم فێری فارسی کرد. تەناتەت من دڵنیا نەبووم لەوەی کە ئایا بەڕاستی فێری زمانی فارسی بوومە یان نا. یەکەسەر، وەك ئەوەی نەخشەم بۆ کێشابوو، سەفەری ئەفغانستانم کرد. تەنانەت من تاقیکردنەوەی چوونە قوتابخانەی باڵام لەبیرکردبوو. من پێویستم بە سێ هەفتە هەبوو تا بگەمە ئەفغانستان. سێ مانگم لە ئەفغانستان بەسەر برد. ئەمە یەکەمین بەریەککەوتنم بوو لەگەڵ ئیسلام و خۆرهەڵاتی ناوەڕاست.

کریسلەر:

ئەوە چ ساڵێك بوو، وە تۆ ئەوکاتە تەمەنت چەند بوو؟

ئۆلیڤەر ڕوا:

ساڵی ١٩٦٩ بوو، ئەوکاتە تەمەنم نۆزدە ساڵ بوو.

کریسلەر:

لەو کاتەدا ئەو وڵاتە زۆر جێگیرتر بوو وەك ئەوەی لەدواتردا بارودۆخ نائارام بوو.

ئۆلیڤەر ڕوا:

نەك تەنها ئەفغانستان، بەڵکو ئەو ناوچەیە بەتەواوی تێکچوو. ساڵی ١٩٦٩ تۆ لە پاریسەوە بۆ نیودەلهی، پێویستت تەنها بە دوو ڤیزا هەبوو، بۆ سەفەرکردن. نە شەڕ لەئارادابوو، نە شەڕی ناوخۆ

و نە شۆڕش و نە هیچ. لەبەرئەوە ئێمە وەکو هیپی، قژێکی درێژو جلوبەرگی ئەورووپیمان پۆشیبوو، کەسیش هیچی نەدەوت. یەکەمین وێستگەمان ئەستەنبوڵ بوو، دووەم تاران و دواتر کابول، بۆ زۆرێك لە خەڵکانی تر کەتماندوی پایتەختی نیپاڵ. من زۆر شانازیم بە کەلتوری هیپی شەتەکانەوە دەکرد، ئەوە بۆ من ڕێگەیەك بوو بۆ بەشداری سیاسی لە ژیانی پاریس لەو سەردەمەدا.

کریسلەر:

بە سەفەرکردنت بۆ ئەو ناوچەیە، چی وایلێکردی کە لەسەر کەلتوری ئەو ناوچەیە دیراسە بکەیت، بۆچی ئەوەت هەڵبژارد، کە دژ بە ئەوانی تر بیت؟

ئۆلیڤەر ڕوا:

لە ئەفغانستان من هەر بە پا گوند بە گوند دەڕۆیشتم، وە لە نزیکەوە لەگەڵ جوتیارەکانی ئەفغانستاندا ڕووبەڕوو قسەم دەکرد. من سەبارەت بە دوو شت ئەوەم دەکرد. یەکەم، ئێمە هەموومان مرۆڤین، ئێمە دەتوانین بەیەکەوە قسە بکەین، مشتومڕ لەسەر ژیان و شتی تری لەو بابەتە بکەین. دووەم، ئەوێ بەتەواوی کۆمەڵگەیەکی جیاواز بوو. بێگومان لەو کاتەدا، گەنج بووم، ڕۆحێکی ڕۆمانتیکیم هەبوو. لەبەرئەوە من لەبارەی ژیانی گوندەکانەوە بیرم دەکردەوە. ئەو کەلتورە جیاوازانە و ئەو پەیوەندییە نزیکانەی ئەوان وایلێکردم کە بڵێم:" ئۆکەی من ئامادەم دیراسە لەسەر ئیسلام بکەم، من دەتوانم لەبارەی فارسەکانەوە زیاتر شارەزابم. من گەڕامەوە نەك لەبەر ئەوەی

کە لەو کۆمەڵگەیە بگەم، بەڵکو من بە خەیاڵ هەمیشە لەو کەلتورەدا دەژیام. من لەو کاتەدا بۆ دیراسەی ئەکادیمی کارم لەسەر ئەو کۆمەڵگەیە نەکرد. هیچ فکرەیەکیشم لا گەڵاڵە نەببوو بەوەی کتێبی لەبارەوە بنووسم، یان دیراسەی ئەنسرۆپۆلۆجی یان هەر شتێکی لەو بارەیەوە سەبارەت بە خۆرهەڵاتی ناوەراست سەرقاڵم بکات. هەر خۆم ئارەزووم دەکرد کە هەموو ساڵێك سەفەر بۆ ئەفغانستان بکەم. دوای ئەوە هەمیشە لە پایزدا دەگەڕامەوە بۆ فەرەنسا و بەردەوام دەبووم لەسەر کارەکەم. لەو کاتەدا من مامۆستای قوتابخانە بووم، زۆر خۆشحاڵیش بووم بەوەی بوومە مامۆستای قوتابخانە.

# لێکۆڵینەوە لەسەر ئیسلام

کریسلەر:

یەکێك لە کتێبە باشەکانت بە ناوی " شکستی ئیسلامی سیاسی" و ئەم باسە بووە یەکێك لە باسە گرنگەکان بۆ ئەمریکا، بەتایبەت دوای ڕووداوی ١١ی سێپتەمبەر. من حەز دەکەم تۆ بتوانی لەسەر ئەم مەسەلەیە بدوێیت، کە چۆن بووەتە کێشەیەکی جیهانی. باشترین ڕێگە چییە بۆ بیرکردنەوە لە ئیسلام لە چرکەساتی ئیستەماندا؟

ئۆلیڤەر ڕوا:

ئیسلام ئایینە، مادام ئایینە بۆیە دەتوانرێت بە چەندین فۆرمی

سیاسی کاری لەسەر بکرێت. ئەم ئایینە لە چەندین کەلتور و کۆمەڵگەی جیاوازدا خۆی گونجاندووە. ئیسلام وەك ئایین، کێشە نییە. زۆرێك لە خەڵك وابیردەکەنەوە کە دەبێت کەسەکان ئەوە بزانن کە ئیسلام دەیڵێت،، بەڵام ئەوە ئامانجی من نییە. گرنگیەکە لەوەدایە بۆ من کە جیاکاری بکەم لەنێوان ئەوەی موسوڵمان دەیڵێت و ئەوەی ئیسلام دەیڵێت. لەبەر ئەوە ئیسلام لە پراکتیزەکردندا، ئیسلام لە ئاخافتن و گوتاردا، جیاوازە لە پراکتیزەکردنی خەڵك بۆ ئیسلام و شوێنکەوتووانی ئیسلام. سیاسییەك دەڵێ من لەسەر ڕێبازی ئیسلامم و ڕۆشنبیرێکی موسوڵمانیش هەروادەڵێت. هەندێ جار گەنجەکان خۆپیشاندان دەکەن لەسەر شەقامەکان، جوتیاران ڕادەپەڕن بەناوی ئیسلامەوە، یاخود هەر شتێکی لەم بابەتە.

کاتێك کە من چووم بۆ ئەفغانستان بۆ لێکۆڵینەوە، یاخود بۆ نووسینی کتێبێك، ڕێك دوای داگیرکردنی بوو لەلایەن یەکێتی سۆڤیەتی پێشووەوە. من تێگەیشتم کە موجاهیدەکان هەندێ کات لەلایەن گەنجە ڕۆشنبیرەکانەوە ڕێبەرایەتی دەکران، کە دەکرا لە بارودۆخێکی تردا ئەم گەنجانە ببن بە مارکسی. ئەو گەنجانە خوێندکاربوون. ئەوان بە سیستەمێکی نوێی پەروەردە گۆشکرابوون. هەندێ جار ئەوان بە زمانی بێگانە قسەیان دەکرد. ئەوان گەنجی زۆر شارەزا بوون. بۆ نمونە کەسێکی وەکو مەسعود ئەحمەد شاد. ئەو گەنجانە بەناوی ئیسلامەوە شەڕیان دەکرد. کەچی زاراوەی مارکسیان بەکار دەهێنا: شۆڕش ، دەوڵەت، ئایدۆلۆجیا و شتی لەو بابەتە. لەبەرئەوە ئەم تێکەڵبوونە لەنێوان مارکسیزمی مۆدێرندا، گەر بتوانم بڵێم ئایین سیحرمان پێدەبەخشێت. من دەمەوێت سەبارەت بە

ئامانجی موجاهیدەکان دیراسە بکەم، کە لەو سەردەمەدا بانگێشتی دروستبوونی دەوڵەتی ڕاستەقینەی ئیسلامیان دەکرد.

ئەو گەنجانە لەسەر ڕێبازی پیاوانی ئایینی نەریتخواز و لێکۆڵەرەوە ئیسلامییەکان نەدەڕۆیشتن. پیاوانی ئایینی هەمیشە گرنگییان بەوە نەدەدا کە کێ سەرزەنشتیان دەکات. بەڵام هاوڕێ نوێیەکانم لەو سەردەمەدا ئەو ئیسلامیانە بوون، کە من وا بانگم دەکردن کە ئەوان داوای دروستکردنی دەوڵەتێکی ئیسلامییان دەکرد، ئایدۆلۆجیای ئیسلامییان بەکار دەهێنا، بۆ ئەوەی کۆمەڵگە بە ئیسلام بکەن، تاکو بتوانن ئابوری ئیسلامی پێکبهێنن..هتد. لەبەر ئەوە لە لۆجیکدا، ئەوە پرۆژەیەکی مۆدێرنە. ئەوە بۆچونێکی مۆدێرنە سەبارەت بەوەی کۆمەڵگە و دەوڵەت چۆن بێت. من دوای ئەوە دەکەوتم. دواتر من چوومە ئێران، لە ئێرانیش هەمان شتم بینی. ئامانجی من ئەوە بوو کە بزانم ئەوان چ پرۆژەیەك پراکتیزە دەکەن. بۆ ئەوەی بزانم لە چ ئاستێکدا ئەوان دەتوانن دەوڵەتی ئیسلامی دروست بکەن. کاتێك من لە کۆتایی هەشتاکاندا جارێکی تر سەردانی ئێرانم کرد ، بۆم دەرکەوت کە دەوڵەتی ئیسلامی نەیتوانیوە ئیش لەسەر ئایین بکات. لەبەر ئەوەی درەنگ یان زوو سیاسەت بەسەر ئاییندا سەردەکەوێت.

کریسلەر:

با واز لەمە بێنین. ئەی لەبارەی ئیسلام خۆی کە جۆرێك لە نەگونجان دەخولقێنێت؟ ئایا بەشێك لەم کێشەیە پەیوەندی بە ئایین خۆی و کۆنسێپتە سەرەکیەکانییەوە نییە؟

ئۆلیڤەر ڕوا:

نەخێر. بە بڕوای من کێشەکە ئیسلام نییە. کێشەکە بریتییە لەوەی کە من چۆن وێنەی ئیسلام دەکەم. با بە ڕستەیەکی زۆر سادە بۆت ڕوون بکەمەوە. لە ئیسلامدا هیچ جیاکارییەك لەنێوان ئایین و سیاسەتدا نییە. دەتوانی بۆ ئەمە چەندین بەڵگە بهێنیتەوە. کێشەکە ئەمە نییە، ئایا ئەم ڕستەیە لە قورئاندا هەیە؟ کێشەکە ئەوەیە کە خەڵك بەگشتی چۆن لەم ڕستەیە تێدەگات. یان سیاسەتکاران چۆن لەگەڵ ئەم ڕستەیەدا مامەڵە دەکەن؟ لەڕاستیدا ئەمە هەڵگری زیاد لە بۆچونێکە. پرۆژەی دروستکردنی دەوڵەتی ئیسلامی پێویستی بە شۆڕش و دامەزراوە و دەستور و ئایدۆلۆژیا و شتی تر هەیە، کە ئیشی لەسەر نەکراوە، نەك لەبەر ئیسلام، لەبەر ئەوەی لەڕاستیدا شتێك نییە بەناوی دەوڵەتی ئایینی. تۆ دەوڵەتت هەیە کە مومارەسەی ئایین دەکات. تۆ دەوڵەتگەلێکت هەیە کە شەریعەتی ئایینی بەکار دەهێنن، بەڵام تۆ ناتوانیت دەوڵەتێکت هەبێت، بەتەنها لەسەر بنەمای ئایینی دامەزرابێت، هەر ئایینێك بێت.

کریسلەر:

ئەمە چۆن دەکرێت، بۆچی ئەمە ڕوونادات؟

ئۆلیڤەر ڕوا:

لەبەر ئەوەی بێگومان هەموو ئایینێك لەسەر باوەڕ و فەزیلەت دامەزراوە، ئەگەر بتوانین ئەمە بڵێین. ئایینەکان پشت بە چەمکگەلی ئەخلاقی چاکە و خراپە و شتی تر دەبەستن. بەڵام تۆ ناتوانی حوکمی

کۆمەڵگەیەك تەنها بە کۆنسێپتە ئەخلاقییەکان بکەیت، کاتێك نەبێت کە هەمووومان فریشتەبین. لەراستیشدا ئێمە هەمووومان فریشتە نین. لەبەر ئەوە لێرەدا بەراوردێکی چاك هەیە لەنێوان ئەم جۆرە لە خەون لەگەڵ یۆتۆپیای پیوریتانی.

کریسلەر:

مەبەستت لە یۆتۆپیای پیوریتانی ئەمریکییە؟

ئۆلیڤەر ڕوا:

بەڵێ، مەبەستم لە یۆتۆپیای پیوریتانی ئەمریکییە. سەرۆك محەمەد خاتەمی لە ئێران هەمیشە بە شێوەیەکی پۆزەتیڤ باس لە پیوریتانەکانی ئەمریکا دەکات، لەبەرئەوەی لەراستیدا، ئەوە هەمان وێنەیە، کە تۆ دەتەوێ کۆمەڵگەی لەسەر بنەمای تاکەکەسی و فەزیلەت بنیاد بنێی. بەڵام درەنگ یان زوو، بێگومان گەندەڵی دێتە ئاراوە. من دەمەوێ بڵێم کە ئازادی گشتی ئەوەیە کە تۆ پێویستت بە دەستور هەبێت بۆ کارکردن لە کۆمەڵگەیەکدا. تۆ ناتوانی متمانە بە فەزیلەتی دادوەر یان فەزیلەتی سەرۆکەکەت بکەیت. تۆ پێویستە دەستور بنیاد بنێیت. لەبەر ئەوە بەو مانایە درەنگ یان زوو سەرکەوتنی سیاسەت بەسەر ئاکاری ئایین و بیرکردنەوەی ئایینیدا دەبینین.

کریسلەر:

لەبەر ئەوە، بە هەر شێوەیەك بێت مۆراڵیتی و مۆدێرنیزەیشن

میتۆدێکی سیاسی لەگەڵ خۆیاندا دەهێنن، کە لەگەڵ بنەما ئایینیەکاندا ململانێ دروست دەکات. تۆ لەم بارەیەوە دەڵێی چی؟

ئۆلیڤەر ڕوا:

من مەبەستمە بڵێم کە تۆ دەبێت بۆچوونە دینییەکانی کۆمەڵگە جارێکی تر بە تێرمە جیاوازەکان دابڕێژیتەوە. تۆ ناتوانی بەتەنها ئەوە بڵێی،کە جیاوازی نییە لەنێوان سیاسەت و ئاییندا. لەبەر ئەوەی زەمینەیەکی تاکەکەسی سیاسیت هەیە، درەنگ یان زوو، پەلکێشت دەکات بەرەو زەمینەیەکی تاکەکەسی ئایینی. وە بۆ ئیسلام لە ئیستادا، ئەمە بەربەرەکانییە. چۆن دەتوانین زەمینەیەکی تاکەکەسی ئایینی وێنا بکەین. چۆن ئەوە قبوڵ دەکرێت، چۆن تیۆریزە دەکرێت، بۆ بوون بە تیۆر، لەبارەی جیاکردنەوەی ئایین و سیاسەت، پێویستمان بە ئیشکردنە.

کریسلەر:

بۆچی نەتوانراوە ئەمە ئەنجام بدرێت؟

ئۆلیڤەر ڕوا:

لەبەر ئەوەی لە هزری نەریتپارێزی ئیسلامدا جیاوازی لەنێون ئایین و سیاسەتدا نییە. لە ڕاستیدا هەمیشە جیاوازی پراکتیکی لە ئارادابووە. ئەوانەی لە مێژووی جیهانی موسوڵماندا حوکمیان کردووە، هەرگیز پیاوی ئایینی نەبوون. حوکمکەران هەمیشە بۆ خەڵك دەسەڵاتیان دەگرتە دەست، نەك بۆ ئایین. کاتێك ئەوان دەسەڵاتیان دەگرتە

دەست، ڕاهاتبوون دەیانوت:" ئێمە کۆمەڵگەیەکی موسوڵمانین، شەریعەت لە دەوڵەتدا حوکم دەکات". وە ئەم یاسایە ڕێگەی دەدا بە پیاوانی ئایینی کە بڵێن جیاوازی لەنێوان ئایین و سیاسەتدا نییە. بەڵام ئیستا ئیسلامیستەکان دەخوازن دەوڵەتی ئیسلامی بنیاد بنێن، ئەوان جارێکی تر بیر لە پەیوەندی نەریتی نێوان ئایین و سیاسەت دەکەنەوە. ئەوان ناتوانن درێژە بە کردەوەی ئەمیر و سوڵتانەکانی ڕابردوو بدەن، لەبەرئەوەی ئەم ڕێگە تەقلیدییە بۆ دەوڵەت لەگەڵ بۆچونگەلی ئایدۆلۆجیدا ناگونجێت، بەوەی کە دەبێت دەوڵەتی ئیسلامی چۆن بێت و چۆن نەبێت. لە دەوڵەتی ئیسلامیدا، سەرۆك، سەرۆکی دەوڵەت، پێویستە موسوڵمانێکی ڕاستەقینە بێت، باشترین موسوڵمان بێت لەناو هەمووواندا. لێرەدا ئێمە کێشەیەکمان هەیە. چۆن دەتوانین کەسێك دەستنیشان بکەین بۆ سەرۆکی دەوڵەت کە موسوڵمانێکی ڕاستەقینە و هەڵگری پرەنسیپەکانی ئیسلام بێت؟

# ئیسلامیستەکان

کریسلەر:

لە وڵاتی ئێمەدا تێنەگەیشتنێك هەیە، لانی کەم لە نەستی جەماوەردا، ئەویش ئەوەیە کە پێویستمان بە تێگەیشتنێکی بنەڕەتی هەیە لەو خەڵکانەی کە پەیوەندی بەو بزوتنەوە پڕۆتیستۆیانەوە دەکەن، کە دەیانەوێت ئایین بە شێوەیەکی محافزکار بەسەر کۆمەڵگە مۆدێرنەکاندا بسەپێنن. ئەو تێنەگەیشتنە لەچیدایە، بۆمانی ڕوون بکەرەوە، ئەو خەڵکانە کێن کە دەچنە ڕیزی ئەو بزوتنەوانەوە؟

ئۆلیڤەر ڕوا:

با نمونەیەك سەبارەت بە بزوتنەوە ئیسلامییەکان بهێنینەوە لە

سالآنی حەفتا و هەشتاکانی سەدەی ڕابردوودا، کە ئەوانیش بریتی بوون لە ئیخوانەکان لە میسر و ڕەفا لە تورکیا و شۆڕشی ئیسلامی لە ئێران، دواکەوتەکانی ئەم گروپانە گەنج و مەدەنی و خاوەن بروانامەن، خەڵکانێك کە پەروەردەی مۆدێرن و لەسەر سیستەمی پەروەردەی خۆرئاوا پێگەیشتوون، ئەوان ئەندازیاریان تێدایە. هەموو کەسێك بیر لە ئایەتوڵڵا خومەینی دەکاتەوە، بەڵام ئایەتوڵڵا خومەینی یەکەم ئایەتوڵڵا بوو لە مێژووی ئێراندا دەسەڵاتی گرتە دەست، یان بە مانایەکی تر ئەو ئایەتوڵڵایەکی تەنیا بوو. زۆرێك لە وەزیرەکانی خومەینی گەنج بوون، ڕۆشنبیری پەروەردەی خۆرئاوا بوون. هەمان شت لە ئەفغانستان. لە یەکێتی سۆڤیەتی پێشو هەمان دیاردە بوونی هەبوو. لە تورکیاش بە هەمان فۆرم، لە میسر و مەغریبیش بە هەمان شێوەیە. نەریتپارێزەکان ناتوانن بەربەرەکانی ڕژێمەکان بکەن. لە ڕاستیدا هەمیشە هەر وابووە، کە نەریتپارێزەکان پشتیوانی ڕژێمەکانیان کردووە.، لەبەرئەوەی ئەوان نەریتپارێزن، ئەوان محافزکارن. ئەوان کارەکتەری شۆڕشگێر نین. ئەوان چییان لە شەریعە دەوێت، وا لە ئیسلام دەخوازێت کە پشتیوانی حکومەت بکات، کەچی بەربەرەکانی ڕژێمەکان ناکەن بۆ ئەوەی شکست بێنێت.

کریسلەر:

بەڵام پڕۆتیستۆ لەئارادایە، بەتایبەت ئیستا لەلایەن ڕادیکاڵەکانەوە، ئەمەش بەرهەمی سەدەی بە جیهانیکراوە. بۆچی ئەمە ڕوودەدات، وە بۆچی ئیسلامییە ڕادیکاڵەکان وادەکەن؟

ئۆلیڤەر ڕوا:

لەو بڕوایەدام زۆرێك لە ئیسلامیستەكان لە ڕابردوو ئیستادا، میراتگر و نەوەی بزوتنەوە مۆدێرنە لیبراڵەكانن. ئەوان دژە ئیمپریالستن. ئەوە زۆر ڕوون و ئاشكرایە، بۆ نمونە ئێران، هەموو مشتومڕەكان بەدەوری ئابووریدا دەخولێتەوە، كە لەسەر بنەمای ئیسلامی دانەمەزراون، بەڵام بە ئایدیایەكی مۆدێرن و پابەندنەبوون بە ئابووری نیشتیمانی. لەبەرئەوە ئەوان بە شێوازی شەستەكان كار لەسەر سیاسەتی ئابووری دەكەن. كوا ئەوان ناگەڕێنەوە بۆ قورئان بۆ مشتومڕ لەسەر نرخی نەوت، ئەوان بازرگانی نەوت بە نیشتیمانی و خۆماڵی دەكەن. نەخێر، ئەوان وەك سەردەمی شەست و حەفتاكان دیبەیت لە دەوڵەت و خۆماڵیكردن و برینی پەیوەندی لەگەڵ ئیمپریالیزم دەكەن، سەربەخۆن لە بەراوردكردن لەگەڵ دەسەڵاتی ئابووری جیهانی (وەك ئەوەی لە ئەمریكا لەئارادایە). لەبەر ئەوە، ئیسلامیستەكان مۆدێرنن.

كریسلەر:

تۆ لە كۆتەیشنێكی كتێبەكەتدا دەڵێی:" ئیسلامیستەكان هەوڵی ئەوە دەدەن بگەڕێنەوە بۆ شكۆ dignity ی تاكەكەسی خۆیان، وەك ئەوەی پێیان وایە شكۆی ئەوان توشی ڕسوایی و شەرمەزاری بووە". ئەم دیاردەیەمان بۆ شی بكەرەوە.

ئۆلیڤەر ڕوا:

ئەمە كێشەی هەموو كەسێكە، نەك بەتەنها كێشەی ئیسلامیستەكان. لە سەردەمی گلۆباڵیزەیشندا، مرۆڤ وا هەست دەكات كە ناسنامەی خۆی دۆڕاندووە. ئەمەش بەجۆرێكە كە ئەوان بە خۆرئاواییكراون

نەك تەنها لەژێر کاریگەری بڕیارە گەورەکانی ئابووریدا. لەبەرئەوە بێگومان ئەم جۆرە لە نامۆیی، بە فراوانی هەستپێدەکرێ. ئیسلامیستەکان و ئەوانی تر کە جۆرێکن لە فەندامێنتالیزم، خۆیان وەلامیان لایە. وەلامی ئیسلامیستەکان"بەڵێ"یە. ئەوان دەڵێن بەڵێ ئێمە دەتوانین بە مۆدێرنبوون و ناسنامەی ئیسلامی بەیەکەوە کۆبکەینەوە. دەتوانین مۆدێرنێتە بە ئیسلام بکەین. ئیسلامیستەکان دەڵێن ئێمە شانازی دەکەین کە نەخشەدانەری ڕێبازی ئیسلامین، ئێمە شانازی بە خۆمانەوە دەکەین کە دواکەوتەی ڕێبازی ئیسلامین لە ولاتێکی سەربەخۆدا. بەم شێوەیە، بەڵێ، ئەوان دەست لە ناوەخنی شتێکی هەستیار دەدەن.

کریسلەر:

ئایا کێشەیەکی دیاریکراو هەیە کە لەلایەن ئیسلامەوە پێشنیار کرابێت، ئەگەر تۆ بەراوردی بکەیت بە گروپە نارازییەکانی تر لە هەر شوێنێکی جیهاندا بێت؟ ئایا ئیسلام کێشەگەلێکی دیاریکراوی هەیە پێشنیاری بکات بۆ زۆرێك لەوانەی کە ناسنامەی خۆیان ڕادەگەیەنن و باوەشیان بە ئیسلامدا کردووە؟

ئۆلیڤەر ڕوا:

بەڵێ، ئەوە کێشەیەکی گەورەیە. لەڕاستیدا بەکارهێنانی ئایینی تەقلیدی و کۆپیکردنەوەی بە ناسنامەیەکی نوێ بەتەنها ناگەڕێتەوە بۆ ئایینی ئیسلام. بۆ نمونە ئەم دیاردەیە لە هیندستانیش دەبینین. پارتی" بەهاراتا جاناتا" لە هیندستان بە هەمان شێوە دەیانەوێت

هیندۆیزم بنیاد بنێنەوە. بەڵام بەڵێ، لە فۆرمی بزوتنەوەدا بەتایبەت لە دەوڵەتە ئیسلامییەکاندا گورز دەوەشێنن، بۆ؟ یەکەم: بە بروای من ئیسلام ناولێنەرێکی گشتی ئامادە کردووە بۆ کاتیگۆرە جیاوازەکانی خەڵك. رۆشنبیرێکی گەنج و مۆدێرن و پەروەردەکراوی کەلتوری خۆرئاوا دەتوانێ لەگەڵ جوتیارێکی نەخوێندەواردا بە تێرمی ئیسلامی قسە بکات. دووەم: ئیسلام ئایدۆلۆجیایەکی یونیڤێرساڵی ئامادە کردووە، کە هەرگیز لە هیندۆیزم و شینتۆیزم ( ئایینێکی نەریتی یابانیەکانە) و هەر ئایینێکی تر ناچێت. ئیسلام ئایینێکی یونیڤێرساڵە بە ترادسیۆنێکی جەنگئامێزەوە. بەبێ پێویستبوون بە خوێن یان هەر شتێکی لەو جۆرە، بەڵام جۆرێك لە داگیرکاری لە مێژووی ئیسلامدا هەیە، بەدرێژایی نۆستالیژیای ئەوەی کە ئێمە ناسنامەمان ونکردووە، ئێمە شوێنەکانمان ونکردووە، لەبەرئەوە ئێمە دەتوانین لە ئیستەدا پارادیگمی سەردەمی پێغەمبەر زیندوو بکەینەوە، ئەمەش کاتێك کە پایەکانی ئایین لە جیهاندا فراوان بێت. ئەم جۆرە کارکردنە لەلایەن ئیسلامیستەکانەوە رەهەندێکی بە جیهانیکردن و بە نێونەتەوەییکردن لەخۆ دەگرێت، کە بە شێوازێکی نوێیی بە جەنگاوەربوونی ئیسلامی نوێ کار دەکات.

کریسلەر:

بەڵام ئەمە ئەو خاڵەیە کە کاری لەسەر ناکرێت. ئایا لەبەر ئەوەیە کە گرنگیدان بە ئیسلام بە گۆرانی تاکەکەسی کەوتۆتەوە، تاکەکەسێك کە لەگەڵ خۆیدا بەدوای ئازادیدا دەگەڕێ؟

ئۆلیڤەر روا:

ئەم دیاردەیە هەروەها مەسیحیەتیشی داپۆشیبوو. بیرۆکەی "ئوممە" لە کۆمەڵگەی موسوڵماندا، کەرەستەیەکی گەورەیە بۆ جوڵەی سیاسی. هەروەها چەمکی "ئوممە" کۆمەکمان دەکات بۆ ئامادەکردنی ناسنامەیەك لەو دیوی رەگەز و خێڵ و ناسنامە نەتەوایەتییەکان. لە خۆرهەڵاتی ناوەراستدا، هەندێ کات دابەش دەبوو بەسەر دەسەڵاتە کۆڵۆنیاڵەکان و دەوڵەتە تازەدروستبووەکاندا، یان ئیسلامیزم رێگەیەکە بۆ گەرانەوە بۆ رابردوو، بەرەو سەردەمی کۆڵۆنێل. تا ئیستاش، من بروام وایە، زۆرێك لە چەمك و دروشمەکان، لە ئیسلامیزمەوە هاتووە، کە هەرگیز ناگەرێتەوە بۆ ئیسلامیزمی تەقلیدی، بەڵکو ئەوە نەبێ کە وەڵامێکە بۆ کۆڵۆنیالیزمی خۆرئاوا و داگیرکردنی وڵات. ئەوە ناسنامەیەکی پەرچەکردارە.

کریسلەر:

ئەم ناسنامەیە سەرکەوتوو نابێت گەر لە دەسەڵاتێکدا رووبەروو بێتەوە، کە وڵات پایەیەکی دینی هەبوو. ئێمە لە مێژە ئەوە دەبینین کە ئەو جۆرە لە بزوتنەوە سەرکەوتوو نەبوون لە گواستنەوەی وڵات، لە جیهانی موسوڵماندا، ئەوە راستە؟

ئۆلیڤەر روا:

بەڵێ. دژیەك لە ئیسلامیزمدا ئەوەیە کە ئەو بزوتنەوانە شێوەیەکی شەرانگێزی بە دەوڵەت دەبەخشن. لە سەرەتاوە، ئیسلامیستەکان دەیانویست، دەوڵەت کۆنترۆڵ بکەن و دەوڵەتێکی ئیسلامی دامەزرێنن. بردنەوەی دەوڵەت بەمانای بوونی توندوتیژی نایەت، رەنگە ئەوە

لەڕێی پەیوەندییەکانەوە ئەنجام بدرێت. بەڵام بێگومان ئەو دەوڵەتەی کە ڕووبەڕوویان دەبێتەوە، دەوڵەتە بەگشتی، دەوڵەتی میسر و لوبنان و ئێران و دەوڵەتانی تر. لەبەرئەوە ئیسلامیستەکان، زوو بێت یان درەنگ، هەوڵە سیاسییەکانیان پەرە پێدەدەن لە وڵاتەکانیاندا و دەبن بە ناسیۆنالیست، هێندەی ئیسلامیست بن. تەنها چەند مانگێك دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئێران، من وتم کە شۆڕشی ئیسلامی لە ئێران دەگۆڕێ بۆ شۆڕشێکی ناسیۆنالیستی و دژە ئیمپریالیستی، هێندەی شۆڕشێکی پوختی ئیسلامی بێت. پارتی ڕەفا لە تورکیا زیاتر پارتێکی ناسیۆنالیستی تورکییە بە ئەجێندایەکی ئیسلامی قەومی، زیاتر لەوەی پارتێکی شۆڕشگێڕ بێت. حەسەن تورابی لە سودان بە هەمان فۆرم کار دەکات. مەسەلەی دژواری لە بزوتنەوە ئیسلامیستەکاندا، هەمان بنیادنانی دەوڵەتێکی گشتی ئیسلامییە، بۆ هەموو موسوڵمانانی کۆمەڵگە. ئەوان ئیستا بەزۆر مانا دژ بە ناسیۆنالیزمن. ئەوە بۆمن شکستی ئیسلامی سیاسییە. ئەوان نەیانتوانیوە بەڕێگەیەکدا بڕۆن بیانگەیەنێتە دەوڵەت یان نەتەوە.

کریسلەر:

لەبەرئەوە بزوتنەوە ئیسلامی و دینییەکان بەرەنگاری دەوڵەت دبنەوە و دەوڵەتیش کۆنترۆڵیان دەکات.

ئۆلیڤەر ڕوا:

دەوڵەت کاڵیاندەکاتەوە، ئەگەر بتوانن دەوڵەتیش بەدەستبێنن، وەك ئەوەی لە ئێراندا ڕوویدا.

کریسلەر:

لەم بەشەی جیهاندا، کێ چانسی ئەوەی هەیە دەوڵەت بەڕێوەبەرێت؟ تۆ لە کتێبەکەتدا پێشنیاری ئەوەت کردووە کە ئەوەی دەوڵەت بەڕێوە دەبات گروپە یەکگرتووەکانن، بەزۆری گروپە نەریتییەکان لەناویاندا خێڵ یان ڕەگەزێکی دیاریکراون.

ئۆلیڤەر ڕوا:

بەڵێ. لەڕاستیدا تەنگو چەڵەمەی زۆرێك لە دەوڵەتانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، ئەوەیە، لەژێر ڕووکەشی دەوڵەتی مۆدێرندا چی دەگوزەرێت. چەندین سیستەمی هاوکار لەئارادایە. هەروەها ئەو سیستەمانە لەسەر پەیوەندی خێڵەکی دامەزراون، وەکو سعودیەی عەرەبی، یاخود ئایینێکی کەمایەتی دیاریکراو، وەك سوریا، یاخود سیستەمی سەربازی وەك ئەوەی لە جەزائیر دەبینرێت. بەهەرشێوەیەك بێت، ئەوە دەوڵەتێکی ڕاستەقینە نییە. ئەوە تەنها ڕێگەیەکە بۆ سیستەمێکی دیاریکراوی هاریکاری بۆ کارکردن لە بەرژەوەندی خۆیدا. بۆیە لەم بارودۆخەدا ئیسلامیستەکان خۆیان بە ئەلتەرناتیڤ دەزانن، لە پلەیەکی دڵنیاکەرەوەدا هەندێ جار ئەوان سەردەکەون. ئیسلامیستەکان لە جەزائیر هەڵبژاردنە پەرلەمانییەکەی ساڵی ١٩٩١یان بردەوە، لەبەرئەوەی ئەوان دژ بە حوکمی کەمینە oligarchy بوون. ئەوان دەیانوت یاخود دەیاننووسی:" ئێمە نوێنەری هەموو خەڵکین". هەمان شت لە ئێران. حیزبوڵڵای لوبنان بە هەمان شێوە، بێگومان ئەوان نوێنەرایەتی خەڵکی شیعە دەکەن. بەڵام ئەوان بە شیعەکان دەڵێن:" یەکگرن، ئێوە نوێنەرایەتی خاوەن

خاکێکی دیار و خێزانە دەوڵەمەندەکانتان دەکرد. بەڵام ئیستا، ئێوە خەڵکن، ئێوە لەبەردەم لێپرساوێتیدان". لەبەرئەوە، بێگومان ئێمە لێرە لە جەماوەربوون نزیك دەبینەوە. پارتە ئیسلامیستەکان دەیانتوانی فەزای سیاسی چینی خەڵك ئاراستە بکەن، کە لە گەمەی سیاسی بێبەشکرابوون. بەبڕوای من ئەمە دەستکەوتێکی گەورە و پۆزەتیڤە بۆ بزوتنەوەی ئیسلامیست لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا، بەتایبەت لە ساڵانی هەشتاکانی سەدەی ڕابردوودا.

کریسلەر:

بەڵام دواجار، دەوڵەت دەتوانێ سەرکەوتن بەدەست بێنێت، لەبەر ئەوەی ڕژێمەکان کە کۆنترۆڵی دەوڵەت دەکەن، دەتوانن کار لەسەر سیمبوڵەکان بکەن، وە ڕوونیشە دەتوانن کۆمەڵگە بە ئیسلام بکەنەوە و لەلایەن ئەو بزوتنەوانەوە، دەنگەکان کپ بکەن. ئەمە ڕاستە؟

ئۆلیڤەر ڕوا:

بە دڵنیاییەوە. ئەوە لە ئێراندا دەبینرێت. بەڵام لە چەندین لایەنی ترەوە، دەسەڵاتی ڕژێمەکان، کە بە توندی بەکاردەهێندرێن، من دەڵێم، بە ئیسلامکردن بە شێوەیەکی کۆنسێرڤاتیزمانە، دەستی هەیە لە لاوازکردنی تواناکانی پارتی ئیسلامی. پارتی ئیسلامی نەیدەزانی کە ئەوان هەڵگری یاسا نین لە وێناکردنی ئیسلام لە کایەی سیاسیدا. ئەوان دواجار هەستیان بەوەکرد، بەتایبەت لە سەرەتای نەوەتەکاندا، کە ئیسلام دووربوو لە ئیسلامی ڕاستەقینە وەك ئەوەی خۆیان بڕوایان پێیبوو. با نمونەیەکت بدەمێ: لە تورکیا، پارتی ڕەفا لە حەفتاکاندا

دروشمێکی زۆر دیاریان هەبوو. ئەوان دەیانوت، سەیرکەن، لە تورکیا لەسەدا نەوەدی خەڵك دەڵێن ئێمە باوەرداری مزگەوتەکانین، کەچی ئێمە تەنها توانیمان لەسەدا شازدەی دەنگەکانی خەڵك بەدەستبێنین، لەبەرئەوە ئەگەر موسوڵمانانی تورکیا عاقڵانە بیربکەنەوە، ئەوا دەنگ بۆ ئێمە دەدەن و ئەوسا دەتوانین لەسەدا هەشتای دەنگەکان بەدەست بێنین. ئەوان هەرگیز نەیانتوانی لەسەدا بیستی دەنگەکان زیاتر بێنن. بۆچی؟ لەبەرئەوەی پرۆژەی ئایینی تر لەئارادایە. بۆنمونە،ئیخوانەکان، makmondia و muju ، چەندانی تر کە پارتی سیاسین، بەڵام بێگومان کاریگەرییەکی گەورەیان لەسەر سیاسەتی ئەو وڵاتە هەیە. بۆنمونە گروپێکی وەکو nationbundi دەڵێت کە سێ ملیۆن دەنگی بەدەستهێناوە، بەڵام بەرامبەر موچە و دەسکەوت، ئەو دەنگانەی خۆی پەراوێزخستووە. ئەوان هیچ مەبەستێکیان نەبوو بۆ پەیوەندیکردنیان بە پارتی ڕەفاوە بۆ سووربوونیان لەسەر دەوڵەتێکی ئیسلامی. لەبەرئەوە لەپڕدا ئیسلامیستەکان ئەوانەی کە دەیانویست لەگەڵ سەرجەم باوەردارانی موسوڵماندا یەکبگرن لە چوارچێوەی یەك سیاسەتدا دەیانزانی ناتوانن مۆنۆپۆڵی هەموو ئیسلامی سیاسی بکەن، لەبەرئەوەی ئیسلام ئایینێکی بەربڵاوە و کەس ناتوانێ ئیسلامی سیاسی مۆنۆپۆڵ بکات.

# فەندامێنتالیزمی نوێ

کریسلەر:

تۆ پێشنیاری ئەوە دەکەیت کە لێرەدا کاریگەری ئەوەیە کە گرنگی بدرێت بە زۆرێك لەو گروپە ئیسلامیستانە لەبارەی فەزیلەتەوە، بە گورتینێکی پیوریتانیەوە بۆ بەدەستهێنانی رزگاربوونێکی تاکەکەسی. کاتێك کە ئەوان پەرچەکردار دەنوێنن بۆ ئەو کەلتورە جیهانییە سەبارەت بە ڤیدیۆ و داهێنراوەکانی تر، ئەوان شکست دەهێنن کە بتوانن زاڵ بن بەسەر ئەم داهێنراوانەدا، بەڵام، سەرباری ئەوە، ئەوان بوونی هەر کەلتورێکی ئەلتەرناتیڤ دەرووخێنن. ئەم گورو تینە پیوریتانیە نەزۆکی دەخولقێنێت لەنێوان خێزان لەلایەك و دەوڵەت لەلایەکی ترەوە. دەتوانی ئەمە شی بکەیتەوە؟

ئۆلیڤەر ڕوا:

لێرەدا دوو ئیشکال دەبینرێت. یەکەمیان فەزیلەتە وەك فەزیلەتی سیاسی. ئێمە دەزانین تا شۆڕشی فەرەنسی فەزیلەت لەئارادابوو، ئەوەش هەنگاوێك بوو بەرەو تیرۆر، بۆ هۆکارێکی سادە: کەس نەبوو هەڵگری فەزیلەتێکی زۆر. لەبەرئەوە کەسێك دەیویست هەمیشە شەیتان وەدەرنێت، شەیتانی ناو ئێمە، ئەوەش پەلکێشکردنە بەرەو تیرۆر. بۆیە سیستەمێکی سیاسی تەندروست دەتوانێ تەنها لەسەر دامەزراوەکان کار بکات، نەك داخوازی فەزیلەت بۆ سەرکردەیەك. بنەمای هەر سیستەمێك بگریت لەسەر ئەو ئایدیایە وەستاوە کە سەرکردەکانمان زۆر حەکیمن بۆ هەر کەسێك کە چارەنووسەکەی ڕوو لە شکستە.

دووەم کێشە ئەوەیە کە ئێمە چۆن لەگەڵ ترادسیۆن و کەلتور و کۆمەڵگەی مرۆیی هەڵدەکەین—ڕێگەیە بۆ ئەوەی خەڵك بژێت، کار بکات و ئەوەی بیەوێت بیکات، هاوسەرگیری بکات و هەروەها شتی لەو بابەتە؟ لەڕاستیدا ئیسلامیستەکان هەرگیز هەوڵی ئەوەیان نەداوە، کۆمەڵگەی خۆیان بروخێنن. بۆ نمونە لە ئێران، کێشەکە لەبەردەم کۆتایی شۆڕشدا کراوەیە: ئێمە پێویستە چی بکەین لەگەڵ کەلتوری ترادسیۆنی فارسدا؟ بۆ نمونە فیردەوسی: فیردەوسی شاعیرێکی ئیسلامی نییە، بە هیچ شێوەیەك. هەروەها میوزیك و زۆر شتی تر. دوای کەمێك بیرکردنەوەی قوڵی ئاینیانە خومەینی دەیوت" ئۆکەی با کەلەپور و کەلتوری فارس بپارێزین"، وە دواتر ئەوە کرا. ئەوە بەمانای ئەوە دێت کە ئەوان بوونی کەلتورێکی ئیسلامی

فارسیان ناساند. ئەوان توانییان ئەوە بناسێنن کە ئێرانین، فارسن و شتی تریشن. لەبەر ئەوە ئەوان دەستبەرداری ئایدیای دروستکردنی دەوڵەتێکی ئیسلامی پوخت بوون.

با تاڵیبان وەربگرین. بە بۆچوونی من تاڵیبانی ئەفغانستان ئیسلامیست نین. ئەوان فەندامێنتالیزمی نوێن، وەکو ئەوەی من پێیاندەڵێم. کێشەی تاڵیبان بریتی نییە لە دروستکردنی دەوڵەتی ئیسلامی. ئەوان کۆمەڵگەیەکی راستەقینەی ئیسلامییان دەوێت. لەراستیدا ئەوان هەرگیز وا بیریان نەکردۆتەوە کە کە کۆمەڵگە دەبێت لەسەر بنەمایەکی ئیسلامی دامەزرێت. ئەوان وابیردەکەنەوە کە کۆمەڵگە دەبێت ئیسلامی بێت و رۆژێك بێت هەموو موسوڵمانان وەك موسوڵمانێکی راستەقینە رەفتار بکەن. بۆ تاڵیبان و بۆ هەموو فەندامێنتالیستە نوێیەکان و وەهابییەکان، دەبێ مەبەست چی بێت لە موسوڵمانی راستەقینە؟ ئەوە مەبەست لە کەسێکە کە بەتەواوەتی داخوازییەکانی ئایینی ئیسلام جێبەجێ بکات. کەسانێك کە گرنگی بە هیچ شتێکی تر نەدات جگە لە ئیسلام. ئەمەش بەو مانایە دێت کە کەسانێك کەلتوریان نەبێت.

زۆر بە کراوەیی ئەوە دەڵێم کە تاڵیبان شەری کەلتور دەکات. ئەوان پەیکەرەکانی بودایان تێکشکاند. ئەوان هەموو پیاوانیان ناچار کرد کە بە یەك شێوە ریش بهێڵنەوە. ئەوان هەموو شتێکیان حەرام کردبوو گەر پەیوەندی بە کەلتورەوە هەبوایە... ڤیدیۆ، گۆرانی، میوزیك، سەما، رۆمان و شیعر. هەموو ئەوانە و تەنانەت دەنگی گۆرانی باڵندەکان لە ماڵدا، چەندین شتی تری لەو بابەتە. لەبەرئەوەی بەلای

ئەوانەوە ئەوانە شتگەلێکی نێگەتیڤ و بێمانان. بۆ ئەوان ڕوخانی پەیکەرەکانی بودا ئارگومێنتی زۆر باشی دوای خۆی جێهێشت. ئەوان دەیانوت:"ئەوانە پەیکەرگەلێکی ئاینی بودین. لە ئەفغانستاندا کەسێك نییە سەر بە ئایینی بودی، لەبەرئەوە کەس پێویستی پێیان نییە، با بیانڕوخێنین".

بەلاّم لێرەدا ئێمە چیدی لەگەڵ ئیسلامیزمدا بەریەك ناکەوین. چیتر ئێمە خەڵکانێك نابینین کە هەوڵی بنیادنانی دەوڵەت بدەن و کۆمەڵگەیەکی ڕاستەقینە بەڕێوەبەرن. ئێمە لەگەڵ خەڵکانێك مامەڵە دەکەین کە خەون بە بنیادنانەوەی کۆمەڵگەیەکی موسوڵمانی جیهانیدا دەبینن و دابڕن لە کۆمەڵگەکانی تر، مەبەست لە کۆمەڵی موسڵمانانە. هەربۆیە کە فەندامێنتالیستە نوێیەکان هەمان داخوازییان هەیە لەوانە نەوەی دووەمی موسوڵمانان لە خۆرئاوا. نەوەی دووەمی موسوڵمانان... زۆرێك لەوان ( بێگومان نەك هەموویان)... هەست بە نامۆیی دەکەن لەبەردەم کەلتوری بنەڕەتی باپیرانیاندا. ئەوان هەرگیز گرنگی بەوە نادەن کە کەسێك لە گوندێکی مەغریبی عەرەبی چۆن دەژێت. ئەوان هەست بە نامۆییەکی زۆر دەکەن لەگەڵ کەلتوری مۆدێرنی خۆرئاوا. نەك بە گەڕانەوە، بەڵکو بە پەیوەندیکردنیان بە بزوتنەوەیەکی فەندامێنتالیستی نوێوە، پێیان دەڵێن:" گرنگی مەدەن بە کۆمەڵگە، هەر جۆرێك لە کۆمەڵگە، گرنگی مەدەن بە کەلتور، گرنگی مەدەن بە سیاسەت، تەنها هەوڵ بدەن کە موسوڵمانێکی باش بن و کۆمەڵگەیەکی موسوڵمانی ڕاستەقینە بنیاد بنێنەوە.". ئەوان لە وڵاتەکەیاندا هەست بەمە دەکەن، ئەوان دەڵێن ئەمە ناسنامەی ئێمەیە.

کریسلەر:

لەبەر ئەوە شکستی پرۆژەی ئیسلامی سیاسی، ڕێبەرایەتی دەکات بەرەو خەونێك لەسەر بنەمای ئیسلام بنیادنرابێت. ئایا ئەوە ڕاستە؟

ئۆلیڤەر ڕوا:

ڕێبەریکردنە بەرەو دوو شت. یەکەم، بۆ ئیسلامیستەکان خۆیان بریتییە لە بەمایەپوچکردنی ئیسلام. ئەوە کۆمەکیان دەکات بە شتێك کە پێی دەوترێ یەکسانی موسوڵمانان، وەك ئەوەی لە پارتەکانی کریستیانی دیموکراتدا هەستپێدەکرێت. بۆ نمونە تورکیا، پارتی ACT کە شوێنگرەوەی پارتی ڕەفایە، هەروەکو کریستیانە دیموکراتەکان وان. پارتێك زۆر بە ئاشکرا دیموکراتی قبوڵە، ئەندامەکانیان وەك سیمبولە ئاینییەکان پۆشاك دەپۆشن، بەڵام بڕوایان بە فرەیی و پلورالیزمە. وەك ئەوەی من باسی دەکەم، زۆرێك لە موسوڵمانانی وڵاتە جیاوازەکان، لەسەر ئەم ڕێڕەوە دەڕۆن.

دووەم ئاراستە، بریتییە لە فەندامێنتالیزمە نوێیەکان. شوێنکەوتوانی دەڵێن ئێمە نامانەوێت ببین بە کریستیانە دیموکراتەکان. ئێمە بڕوامان بە پلورالیزم نییە. ئێمە ئیستا بڕوامان وایە کە ئیسلام تا ئیستاش پاکترین ئایینە، وە بۆ ئەم مەبەستە، ئێمە ناتوانین لەسەر مەسەلە سیاسی و کەلتورییەکان سازش بکەین. لەبەرئەوە ئەو گەنجانە، خیاری تریان نییە، جگە لە ژیان لە ناو جۆرێك لە جیهانی ناڕاستەقینە و خەیاڵی، کۆمەڵگەیەکی موسوڵمانی ڕاستەقینە.

کریسلەر:

ئیستا ئوسامە بنلادن و ڕێکخراوی ئەلقاعیدە لە کوێی ئەم هاوکێشەیەدان؟ لە ڕاستیدا ئەوان جۆرێك نین لە فەندامێنتالیستی نوێ، لەبەرئەوەی ئەوان زیاتر جەخت لەسەر هێزی سروشتی دەکەنەوە. ئایا ئەوە ڕاستە؟

ئۆلیڤەر ڕوا:

نەخێر، بە بڕوای من بنلادن کارەکتەرێکە تەمسیلی لقی ڕادیکاڵی فەندامێنتالیزمی نوێ دەکات... وەك ئەوەی پێی دەڵێن جیهاد، ئەو خەڵکانەی دەڵێن"ئێمە جیهاد دەکەین". ئوسامە بنلادن بەچەند هۆکارێك کەوتە بەر ڕەخنەی توندی بزوتنەوە ئیسلامییەکانی وڵاتە ئازادەکان. ئەو ڕەخنە لە فەلەستینییەکان دەگرێت. بنلادن دەڵێت:"چی وادەکات ئێوە داوای دەوڵەتی فەلەستین بکەن؟ ئەگەر ئێوە دەوڵەتی فەلەستینتان دروستکرد، ئەو دەوڵەتەش وەك دەوڵەتانی تری لێدێت. ئێوە پێویستە "ئوممە" پێکبێنن، کۆمەڵی موسوڵمانان، بۆ ئەو مەبەستە، نەك بۆ دروستکردنی دەوڵەتی فەلەستین.". بنلادن تەواو دژ بە بیرۆکەی دروستبوونی دەوڵەتی فەلەستینییە. بنلادن پیاوێکە دەیەوێت دژ بە هێزی جیهان، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، سەرجەم موسوڵمانان یەکبخات. ئەو گرنگی نادات بە فەلەستین. ئەو گرنگی نادات بە قاهیرە، بە ئەستەنبوڵ و هتد.. . گەر یەکێك ئارەزووی جیهاد بکات، لە جیهانی پیرۆزی بنلادندا، نە فەلەستینە و نە میسرە و نە سعودیە. ئەو لەکوێ شەڕ دەکات؟ نیویۆرك، بۆسنە، کۆسۆڤۆ، چیچان، سەنتەری ئاسیا، ئەفغانستان، کشمیر، فلیپین و

خۆرهەڵاتی ئەفریقیا. لە سنوری خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا، نەك لە سەنتەری خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا. بنلادن پیاوی بەها گەردونییەکانە. ئەو بەرهەم و کوڕی بەها جیهانییەکانە. ئەو پیاوێکی گێلی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست نییە، لە بیابانەوە نەهاتووە بۆ شەڕکردن لەگەڵ سەلیبییەکان. نەخێر، شەڕی ئەو لە جیهانی مۆدێرندایە.

# خۆرئاوا و ئیسلام

کریسلەر:

ئیستا ئێمە ئەم وێنە فراوانەمان لا دروستبوو، کاریگەری ئەمە لەسەر خۆرئاوا چییە، زیاتر لەوەی بردنی مۆدێرنە و خولقاندنی خەڵکانێك بێت کە دەخوازن پڕۆتیستۆ بکەن، بەڵکو لەڕاستیدا وا بەرهەمهاتوون کە پڕۆتیستۆ بکەن؟ چ کۆنتاکتێك دەکەن لەگەڵ خۆرئاوادا، وە ئایا شەڕی نێوان شارستانییەتەکان گریمانەیەکی چاوەڕوانکراوە؟

ئۆلیڤەر ڕوا:

نەخێر، لەبەر هۆیەکی زۆر ئاشکرا. شارستانییەتەکان چیتر قینیان لە ڕەگ و ڕیشە جیهانییەکان نییە. خۆرهەڵات بە خۆرئاواکراوە، وە ئیسلام لە خۆرئاوایە. زۆرێك لە گەنجەکانی گروپەکەی بنلادن، لەکوێ دەیانەوێ جارێکی تر خەڵك بکەنەوە بە موسوڵمان؟ لە خۆرئاوا، نەك

لە خۆرهەڵات. زۆرێك لە گەنجەکانی گروپەکەی بنلادن لە خۆرهەڵات لە دایکبوون، زۆرێکیشیان لە خۆرئاوا لە دایکبوون و گەورە بوون. بەڵام هەموویان دەیانەوێت خەڵك لە پاریس و لەندەن و نیوجێرسی بە موسوڵمان بکەنەوە.

لەبەر ئەوە ئیستا ئیسلامی رادیکاڵ لە ململانێی خۆرهەڵاتی ناوەراستەوە نەچۆتە نێو خۆرئاواوە. ئەوە بەرئەنجامی تێکەڵبوونی خۆرهەڵات و خۆرئاوایە. کۆمەڵگەکانی خۆرهەڵاتی ناوەراست بە خۆرئاواکراون. ئەوان کۆمەڵگەی شارستانی و مۆدێرنن. کێشەکە پەیوەندی بە کۆمەڵگەی نەریتپارێزەوە نییە، ئێمە کێشەمان لەگەڵ خەڵکی نەریتپارێزدا نییە. ئێمە کێشەمان لەگەڵ خەڵکانێکدا هەیە کە بە خۆرئاواکراون. وە ئیستا لەژێر دەستیاندا، ئیسلام بە شێوەیەکی سنووردار لە خۆرئاوا رەگی داکوتاوە. ئیستا لە ئەوروپا، لەلایەن رژێمە جیاوازەکان و پەرلەمانە ئەوروپییەکانەوە دانیان پێدا دەنرێت.

لەو وڵاتانە لەبەرئەوەی رێژەی موسوڵمان کەمە، لەبەر چەندین رووداوی هەنوکەیی، تا ئیستا تێگەیشتنێکی دروست لەئارادا نییە، بەڵام ئەوە روونە کە لە ئیستادا ئیسلامێکی خۆرئاوا هەیە. ئیسلامی خۆرئاوا جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە لە زاراوەگەلی ئایینناسی، لە ئیسلامی ئەوروپا، ئێمە لەبەردەم دوو ئیسلامدا نین. بەڵام موسوڵمانان ئەزموونی جیاوازیان هەیە لەگەڵ ئەم ئایینەدا، بیروباوەری موسوڵمانان ئەزمونی جیاوازی پێبەخشیون. لە وڵاتە ئیسلامییە تەقلیدییەکاندا، تۆ دەتوانی موسوڵمانێکی نۆرماڵ بیت( لەبەرئەوەی هەموو کەس) کە بەدەوری تۆوەن موسوڵمانن، لەبەرئەوە

دەبێ بەرۆژوو بیت، چونکە دەوروبەرت هەموو بەرۆژوون، دەبێ نوێژ بکەیت، لەبەرئەوەی هەموو کەس نوێژ دەکەن. بەڵام لە خۆرئاوا، تۆ دەتوانی بگۆڕێیت، یان لانی کەم تۆ دەتوانی جارێکی تر بیر لە ناسنامەی موسوڵمانی خۆت بکەیتەوە. ڕەنگە بپرسیت: ڕۆژوو بەمانای چی دێت؟ ئەی نوێژ چ مانایەکی هەیە؟ ڕەت کردنەوەی ئایینەکانی تر مانای چییە؟ لەبەرئەوە ئێمە لەبەردەم جۆرێکی تر لە بنیادنانەوەی ئیسلامداین، ئەمەش لەرێگەی بە نۆرماڵکردنەوە.

کریسلەر:

لێرەوە تۆ باس لە گریمانی گۆران دەکەیت لە ئیسلامدا لە خۆرئاوا، بەجۆرێك کە چانسگەلی بەیەکەوە هەڵکردن لەگەڵ کۆمەڵگەی خۆرئاوا هەستپێدەکرێت، ئەمەش شوێنێکی زۆرباشە لە هەر وڵاتێکی تر کە سەرچاوەی سەرهەڵدانی ئایینی ئیسلامە. ئەمەش کۆمەکم دەکات بۆ ئەوەی پرسیارێك بکەم: ئایا بەشێك لەم کێشانە لێرە کە شکستی جیهانی ئیسلامییە بەرەو ڕازیبوون بە ئابووری مۆدێرن، کە کار دابین دەکات و پسپۆڕ و خاوەن بڕوانامەکان یەکدەخات، هەنگاو بەرەو کۆمەڵگەیەکی ئابوری بەرهەمهێن دەنێت؟

ئۆلیڤەر ڕوا:

ئێمە دەتوانین جیاوازی بکەین لەنێوان وڵاتە عەرەبییەکان و وڵاتە موسوڵمانەکان. ئێمە دەتوانین بەراورد بکەین. بێگومان گەر ئێمە بەراوردی نێوان مەغریب و ئیسپانیا بکەین، ئۆکەی، دەتوانم بڵێم، خەڵکی مەغریب کەمتر چانسی کارکردنیان هەیە، یان شتی لەوبابەتە.

گەر بەراوردی نێوان فلیپین و ئەندۆنیزیا بکەین، ئەوا دەزانین وڵاتی تر هەیە لە فلیپین و ئەندۆنیزیا باشترن. لەبەرئەوە فاکتەرەکە ئیسلام نییە وەك ئەوەی کە هەیە. ئێمە خۆمان لەبەردەم بەراوردکردنی وڵاتاندا دەبینینەوە، کە بەڕاستی شایەنی بەراوردکردنە.

بەڵام ئەوە ڕاستە کە گەر ئێمە وڵاتە عەرەبییەکان وەربگرین، لەوێ کێشەیەك هەیە. وە ئەم کێشەیە پەیوەندی بە خودی ئیسلامەوە نییە. دەتوانم بڵێم ئەمە پەیوەندی بە هەندێ شتەوە هەیە کە زیاتر وەهابیزم کاری بۆ دەکات. بەڵام ئێمە نابێت ئەوە لەبیر بکەین کە وڵاتە عەرەبییەکان هێڵی سنوری نێوان، باکور و باشورن. چەندین ململانێ لەئارادایە، لەڕاستیدا ململانێی باکور و باشور بوونی هەیە، کە سەرچاوەکەی لە وڵاتە عەرەبییەکاندایە، لەوانە ململانێی عەرەب- ئیسرائیل.

بەڵام ڕاستییەك هەیە ئەویش ئەوەیە کە نائومێدییەك هەیە لەنێو موسوڵماناندا، لەبارەی سیاسەتەوە، لەبارەی ئەوەی چۆن لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا بەردەوامی بە ژیان بدەن. جەزائیرییەك لە فەرەنسا دەژی.. یان کەسانێك لەگەڵ جەزائیرییەکدا بژین وا دەزانن لەگەڵ کوڕێکی فەرەنسیدا دەژین... ئیستا ناسیۆنالیستێکی جەزائیری لەبەرئەوەی کەلتورێکی ڕابردووی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتووە.... دان بەوەدا دەنێت کە لە فەرەنسا بژێت باشترە لەوەی لە جەزائیر بژێت. لەبەرئەوە ئێمە لەبەردەم ئەم ئالۆزی و هەندێ جار ئەم دۆخە شیزۆفرینایەداین:" باشترە من لە خۆرئاوا بژیم، من دڵخۆش دەبم گەر خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بەرەو خۆرئاوا جێبێڵم، بەڵام من نامەوێت تەنها ببمە

چاودێر بەسەر خۆرئاواوە". لەبەرئەوە ئێمە لەبەردەم ژیانەوەی ناسنامەکانداین. ئێمە لەبەردەم هاوردەی ناسنامەکاندا نین.

ئەو رێگەیەی کە بیروباوەڕیانی پێدەردەبڕن لە خۆرئاوا، دەتوانم بڵێم بنەمایەکی تاکەکەسی هەیە. ئەوان قسە لەسەر باوەڕ دەکەن، ئەوان باس لە رزگاربوونی تاکەکەس دەکەن. ئەوان باس لە رەگەز و بەها ئەخلاقییەکان دەکەن، لەبەرئەوەی باوەڕ لە خۆرئاوا" نەك تەنها باوەڕی ئیسلامی، بەڵکو هەر بیروباوەڕێکی ئایینی" لەلایەن پێگە و بارودۆخی کۆمەڵایەتییەوە کۆمەك ناکرێت. لانی کەم لە ئەورووپا بوونی هەیە. من دەزانم لە وڵاتاندا خەڵك زۆر بەئاسانی دەتوانن بڕۆن بۆ کەنیسە. بەڵام لە ئەورووپا نا. ئەورووپای خۆرئاوا بە عەلمانیکراوە، لەوانە ئیرلەندا. ئامادەبووی کەنیسە لە هەروڵاتێکدا بڵێیت بۆ خوار لەسەدا دە دابەزیوە. موسوڵمانان ئەزمونێکیان لەگەڵ گەشەکردندا هەیە، کە ئەمەش هەمیشە لە ئەزموونی کاسۆلیکییەکان دەچێت، لە کۆمەڵگەیەکی ئاینییەوە، بۆ کۆمەڵگەیەکی دیاریکراو، کۆمەڵگەیەکی ئایینی کە پێناسەی خۆی وەك کەمینەیەك دەکات. وە بۆ پێناسەکردنی بەهاکانی خۆی دژ بە ژیانی دەوروبەر. لەبەرئەوە لەم روئیایەدا، ئێمە هەندێ جار زۆر بەگشتی لەنێوان کاسۆلیکی محافزکار و موسوڵمانی محافزکارداین، زیاتر لەوەی لەنێوان کاسۆلیکی نەریتپارێز و ئەورووپایەکی لە مەسیحییەت دابڕاودابین.

کریسلەر:

چ کارێك پێشنیاردەکەیت بۆ ئەوەی کە خۆرئاوا بتوانێ سیاسەتێك بەرەو جیهانی ئیسلامی مومارەسە بکات؟

ئۆلیڤەر روا:

من زۆر دڵخۆشم بە پرۆپۆزەڵە سیاسییەکان، لەبەرئەوەی، یەکەم: پرسیار هەیە لەسەر کات و سەردەم. ئەگەر تۆ پێشنیاری هەر حکومەتێك بکەیت بۆ ئەوەی هەندێك پرۆپۆزەڵی سیاسی پێشکەش بکات، ئەوان هەندێ شت پێشنیار دەکەن، لانی کەم بۆ دوو تا چوار ساڵی ئاینده. بەڵام لێرەدا ئێمە دەبێ مامەڵە لەگەڵ کێشەی نەوەکاندا بکەین. لەبەر ئەوە تۆ سیاسەتێکت نییە بۆ تێکەڵکردنی ئیسلام لە خۆرئاوادا، لانی کەم تا هەڵبژاردنی ئاییندەی سەرۆکایەتی. بۆیە بۆچوونی من ئەوەیە کە نابێت جەخت لەسەر ئیسلام بکەینەوە، دەبێت جەخت لەسەر تاکەکان بکەینەوە. ئێمە نابێ لەسەر بەهاکان رێبکەوین، بەڵکو دەبێت بەشێوەیەکی عەقلانی پابەندبین بە بەهاکانمانەوە. یاسا، هەموو یاسایەك، جیاکاری ناکات. ئیستە لە ئەوروپادا لەبارەی مزگەوتەکانەوە مشتومڕ هەیە، بەڵام ئەوە دیبەیتێکی لۆجیکی نییە، لەبەرئەوەی پشت بە یاسا دەبەستێت" بۆ بوونی مزگەوت". کێشەکە دواجار بە هێڵی سووردا تێدەپەرێت، بۆ رازیکردنی سەرۆکی شارەوانییەکی لۆکاڵی تاکو لە کۆسپەکان خۆی قوتار بکات. لەبەرئەوە ئەمە گۆرینی سیستەمی یاسایی نییە بۆ دروستکردنی یاسایەکی ئیسلامی. مەسەلەکە ترسە لە موسوڵمانان، وەك ئەو ترسەی هەمانە لە کاسۆلیکەکان و جولەکەکان و پرۆتستانتەکان، یاخود هەر جۆرە ئایینێکی تر.

# فێربوونی وانەکان

کریسلەر:

بۆ ئەو خوێندکارانەی ئەم چاوپێکەوتنەی تۆ دەبینن، بەوەی کە ئەوان چۆن بتوانن خۆیان بۆ ئایندە ئامادە بکەن، ئەوان پێویستە چۆن بیربکەنەوە لەبارەی جیهانی ئیسلامی و هتد..؟

ئۆلیڤەر ڕوا:

من پێیان دەڵێم هەرگیز بیر لە جیهانی ئیسلامی نەکەنەوە، با ئەوان لەبارەی موسوڵمانانەوە بیربکەنەوە، لەبارەی ئەو خەڵکانەی کە بە واقیعی لە کۆمەڵگەدا دەژین، کێ ئەزموونی هەیە لەسەر ڕوئیای مێژوو، وە کێیە دەتوانێ لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر جیاواز بێت، تەنانەت ئەگەر بڕوای بە هەمان ئایین هەبێت. ئەمە هەروەها بۆ کاسۆلیکەکانیش دروستە. هەرگیز بیر لە زاراوەکانی کەلتوری

کۆمەڵگەکان مەکەنەوە. پێویستە ئێمە کەلتور و ئایین تێکەڵ نەکەین. ئایینەکان دیاردەگەلێکن کەلتورەکان تێدەپەڕێنن. ئەگەر ئێمە ئیسلام بچوك بکەینەوە بۆ کەلتور، ئەوا ئەوسا ئیسلاممان وەك ئایین کوشتووە. هەروەها ئەمە مەسجێکە بۆ موسوڵمانان خۆیان: هەرگیز پرسیار مەکە لەوەی ئایین وەك گروپێکی کۆمەڵایەتی بناسێنیت، لەبەرئەوەی تۆ ڕەهەندە جیهانییەکانی ئیسلام وەك ئایینێك وندەکەیت.

پوختەی قسەکانم ئەوەیە کە بەئاگابین لە مەڵتیکەلتڕالیزم وەك پایەیەك بۆ هاریکاریکردنی ئەوەی کە تۆ ناسنامەیەکی گروپێکی دیاریکراوت هەیە. ناسنامەکان هەمیشە ئەزمونکراون، نەریتن، ناسنامە نابێت دژ بە ئازادی بێت. لەبەر ئەوە، بەلای منەوە، گرنگترین شت بریتییە لە ئازادی تاکەکەسی و مافی بەردەوامبوون لەسەر ئەزموونە جیاوازەکان، بۆ شێوەگرتنی خەونەکانی تۆ وەك ئەو ناسنامەیەی خۆت لەسەریت.

کریسلەر:

ئەم چاوپێکەوتنە لەگەڵ تۆدا زۆر بەنرخ بوو. تۆ لە ساڵانی شەستەکان لە پاریس دەژیایت، هەرچۆنێك بێت، تۆ دوو ساڵ هەڵگری بیروباوەڕی (ماو) بویت، بەڵام کاتێك تۆ گەشتی ئەفغانستانت کرد، کێشەکە بوو بە بنەڕەتی، " سەلاحیەتی ئەو پرۆژە سیاسییە چیبوو، ئەو ئیسلامیستانەی بەدوای هەڵگیرساندنی شۆڕشدا دەگەڕان؟". چ وانەیەکت لەو گەشتە وەرگـرت، سەبارەت بە تێگەیشتنت لەو کۆمەڵگە ئاڵۆز و کەلتورە جیاوازە، بەجۆرێك وایلێکردی حەقیقەتی

ئەو کۆمەڵگەیە بەچاوی خۆت ببینیت؟

ئۆلیڤەر ڕوا:

وەك ئەوەی تۆ وتت. سەفەرەکەم بۆ چەندین وڵاتی جیاواز بوو، سەفەرەکەم فرینێکی تاکەکەسی بوو بە کۆمەڵێ ئەزموونەوە. بێگومان، قەت دروست نابێتەوە، ئەزمونەکانت لەگەڵ خەڵکانی تردا. هەمیشە، کاتێك تۆ شتێك قەرز دەکەیت، خراپترین جۆری هەیە، ئەوە بەشێکی دۆگمای ئەزمونە. لەبەرئەوە، وەڵامەکەم ئەوەیە، تۆ ئەزمونێکی تاکەکەسی جۆراوجۆرت هەیە، بەوەی کە لە شوێنێکی تر بژیت، یاخود سەفەر بکەیت، بەوەی بخوێنیتەوە، یاخود چاوت بە کەسانێك بکەوێت. ئەوە ئەزموونێکی تاکەکەسییە.

کریسلەر:

بەم تێبینییەت، من دەمەوێت سوپاست بکەم ، بۆ ئەوەی کە ئەمڕۆ لێرە ئامادە بویت و بەشداریت کرد لەگەڵمان بەو گەشتە دوورودرێژە ڕوناکبیرییە.

ئۆلیڤەر ڕوا:

زۆر سوپاس

# بە جیهانیبوون

کریسلەر:

دەتوانی لەبارەی ئەوەوە بۆمان بدوێیت کە چۆن گلۆباڵیزەیشن بۆ هەموانە، وە چۆن دەتوانێت ژیانمان بگۆڕێت؟

ئۆلیڤەر ڕوا:

دەتوانین وا پێناسەی جیهانگیری بکەین وەك ئەوەی بەشێکی سەرەکییە لە فەزای گشتی، کە بە هیچ شێوەیەك بنەمایەکی لۆکاڵی نییە. ئێمە دەتوانین بەو بنەمایەوە پەیوەندیمان هەبێت، بێگومان ئەمەش لەڕێی ئەنتەرنێتەوە، وە هەروەها بە ماناگەلێکی جیاواز، لەم فەزایەدا بەها و ئایدیا و ژینگە و نۆرمەکان دەبن بە شتگەلێکی سێکولار بەبێ ئەوەی فۆرمی کەلتورێکی دیاریکراو بدات بە کۆمەڵگەیەکی دیاریکراو. لەبەر ئەوە بێگومان کە زمانەکان لە کەلتورێکی

دیاریکراودا سنوردار دەکرێن، وە زمانی ئینگلیزی دەبێتە زمانێکی جیهانی. خەڵك دەتوانێ لەم فەزا جیهانییەدا بە ئاسانی پەیوەندی بکات.

کریسلەر:

دەتوانی نمونەیەکمان بۆ بهێنیتەوە کە چۆن بۆ نمونە ئەمریکا بەشێکە لەم فەزا گشتییە. ڕەنگە خۆیان بەتەواوی ئەوە نەزانن.

ئۆلیڤەر ڕوا:

با نمونەیەکت بدەمێ، ئەگەر تۆ لایەنی جلوبەرگ وەربگریت، لە پانتۆڵی کابۆی شینەوە بۆ جلوبەرگی سەر شەقامەکان. تەماشای گەنجەکان بکە لە شوێنە هەرە جیاواز و دوورەکانەوە، یەك جۆر لە پۆشاك دەپۆشن. جلوبەرگی گەنجان لە ئەمریکا هەمان جلوبەرگە کە گەنجانی فەرەنسا و بەریتانیای دێرین و خۆرهەڵاتی ئەوروپا و گەنجانی وڵاتە جیاجیاکانی تری جیهان دەیپۆشن.

هەروەها خواردن. با باس لە کاریگەرییەکانی ماکدۆناڵد بکەین. تۆ ماکدۆناڵد لە هەموو شوێنێکی جیهاندا دەبینیت. لێکچون لە ماکدۆناڵد و خواردنی خێرا ئیستا دیاردەیەکی تەواو بەرچاوە لەناو گەنجەکاندا.

بەهەمان شێوە مشتومڕەکان: مشتومڕ لەبارەی بۆ نمونە مافەکان، هەمان مشتومڕە کە لە بەریتانیای دێرین دەکرێت، لە ئەمریکا، زیمبابۆی، هیند و تەنانەت لە سین، هەمان مشتومڕ لەئارادایە.

لەبەر ئەوە گلۆباڵیزەیشن چەمکی بە جیهانیبوونی نۆرم و بەها و مشتومڕ و خێراییەکانە. خەڵك چاودێری دەکات کە لە هەرسوچێکی ئەم جیهانەدا چی دەگوزەرێت. هەر مشتومڕێکی گرنگ کە لە دەوڵەتاندا رووبدات مشتومڕی خەڵکانی دەرەوەی ئەو کۆمەڵگەیەشە. نمونەیەك وەربگرە، مشتومڕ لەبارەی ڕاسیزم لە بەریتانیای دێرین، خۆپیشاندانی هەنوکە لە هیندستان دژ بە ڕاسیزم هەمان کێشەیە کە لە هەر شوێنێکی تری جیهاندا لەئارادایە.

کریسلەر:

لە ئیستادا دوو فاکتەر دێتە خەیاڵمان. یەکێکیان بریتییە لە هێزی تەکنەلۆژیا بۆ گەیاندنی شتەکان، دووەمیشان بریتییە لە بە جیهانیبوونی سەرمایەی نێونەتەوەیی بە ڕێگەیەکی نوێ. ئایا ئەم دوو فاکتەرە بۆ گلۆباڵیزەیشن دروستن؟

ئۆلیڤەر ڕوا:

بێگومان، تەکنەلۆژیا یارمەتیدەرە بۆ بڵاوبوونەوەی گلۆباڵیزەیشن. بەڵام گلۆباڵیزەیشن بەتەنها لە ئەنجامی تەکنەلۆژیای نوێوە بوونی نابێت. گلۆباڵیزەیشن پێش داهێنانی ئینتەرنێت دەستی پێکردووە، بەڵام ئینتەرنێت فاکتەرێکە بۆ ئەوەی هەست بکەین لەئارادایە. لەبەر ئەوە تەکنەلۆژیا بەشێکە لە جیهانی نوێ، بەڵام تاکە هۆکار نییە.

کریسلەر:

ئەم دیاردەیە چ کاریگەرییەکی لەسەر تاك هەیە؟ چۆن تاك دەتوانێ

ئەم دیاردەیە بکاتە کێشەیەکی سەرەکی خۆی؟

ئۆلیڤەر ڕوا:

کێشەی سەرەکی وەك ئەوەی تۆ باستکرد ئەوەیە کە گەنجان چیتر پێویستیان بە فشاری کۆمەڵایەتی نییە لەسەر ئازادی جل و بەرگ، تەنانەت لە سەر ژیانێکی لۆکاڵی و پێگەی کۆمەڵایەتی کاریگەر. تۆ دەتوانی مشتومڕ بکەیت، تۆ دەتوانی خۆت بیر بکەیتەوە وەك کەسێکی کاریگەر لە بەشداریکردن لە دیبەیتەکاندا، دەتوانی چاودێری جیهان بکەیت لەوەی کە لەوێ چی دەگوزەرێت، دەتوانیت بۆچوونت لەسەر شتەکان هەبێت گەر دوور و نزیك پەیوەندی بە تۆشەوە نەبێت، بەبێ ئەوەی پەیوەندیت هەبێت بە کەلتورێکی کۆمەڵایەتییەوە، بە کۆمەڵگەیەکی لۆکاڵییەوە، یاخود تەنانەت وەك هاووڵاتییەکی لۆکاڵی. لەبەر ئەوە ئێمە لەم جیاوازییە سودمەند دەبین کە لەنێوان لۆکاڵ و گلۆباڵدا بوونی هەیە. تۆ ڕەنگە بڵێی چ چانسێك لێرەدا هەیە؟ لێرەدا ناسنامەگەلێکی نەتەوەیی بوونی هەیە لەوەی تەنها ناسنامەگەلێکی لۆکاڵی خۆی بسەپێنێت. ئەوەی هەڕەشەیە بۆ سەر گلۆباڵیزەیشن بریتییە لە ناسنامەی نەتەوەیی و وڵات و نەتەوەی نەریتپارێز.

کریسلەر:

سەرباری هەموو ئەمانە، دەبێ ئێمە وریا بین لە فەرامۆشکردنی خەڵك وەك جەستە.... کۆچپێکردنی جیهانی، جێهێشتنی شوێنە

لۆکاڵییەکان و هتد. کەمێك لەم بارەیەوە بدوێ. وەك دەبینرێت ئەمانە فاکتەری سەرەکین لە ژیانی ئیستەماندا.

ئۆلیڤەر ڕوا:

بەڵێ ئەوانە فاکتەری سەرەکین، بێشك دیاردەی کۆچ بەشێکە لە پەیوەندیکردن یاخود گواستنەوە، بەڵام پەیوەندیکردن لە پشتەوەی کۆچکردنەوە دەگوزەرێت. دیاردەی کۆچکردن تەواو فراوانبووە، بە شێوەیەکی گشتی لە خۆرهەڵاتەوە بۆ خۆرئاوا یان لە باشورەوە بۆ باکور ڕوو دەدات. بەڵام ئەمە هەموو حیکایەتەکە نییە. خەڵکانێك هەن دەیانەوێت بگەڕێنەوە یاخود هیچ نەبێت کۆچ نەکەن. تۆ گواستنەوەی روناکبیریت هەیە، کە ئەمە زۆر گرنگە. ئیستا بۆ نمونە تۆ دەتوانی لە وڵاتانی ئەوروپا خوێندن تەواو بکەیت و چەندین ساڵ لە ئەفریقا ژیان بگوزەرێنیت و لە سەنگاپۆرە یاخود تۆکیۆ نیشتەجێ بیت. لەبەر ئەوە ئێمە سپەیسێکی جیهانیمان هەیە بۆ لێکۆڵینەوە کە چانسی یارمەتیدەرە بۆ پرۆگرام لە وڵاتە جیاوازەکاندا یاخود لانی کەم یارمەتیدەرە بۆ دیبەیت لەسەر کێشەگەلی کەلتورێکی دیاریکراو. هەروەها تۆ گواستنەوەت هەیە لەبواری پرۆفیشناڵدا، یان خەڵکانێك بۆ نمونە ئەندازیار و تەکنیککار  کە دەتوانن لێرەوە بۆ ئەوێ بچن. هەروەها ئێمە گواستنەوە و پەیوەندی بنەرەتیمان هەیە، بۆ نمونە خەڵك دەتوانێ بە جەستە لەماڵەوە بێت و بە ئینتەرنێت

پەیوەندی بکات. بۆ نمونە ئەندازیارێکی کۆمپیوتەری هیندی لە ولاتێکی ئەوروپا دەتوانێت لەسەر تۆڕێکی گواستنەوەی ئینتەرنێت لە ولاتەکەی خۆی کار بکات، یاخود خەڵك فێر بکات. لەبەر ئەوە گواستنەوە دیاردەیەکی گشتییە کە زۆر لەوە ئاڵۆزترە کە تەنها بە کۆچکردن بەراوردی بکەین.

# ئایین و کەلتور

کریسلەر:

من دەمەوێ دوو کۆتەیشن لە کتێبەکەی خۆتت بۆ بخوێنمەوە. تۆ دەڵێی:" رەهەندە ریشەییەکانی گلۆبالیزەیشن لە ئیستادا بریتییە لە گۆرینی رەفتاری مرۆڤ بۆ سیستەم و بەکارهێنانی قسەی خێرا و گەیاندنی کەلتورێکی دیاریکراو". وە دواتر وەك ئەوەی کە ئاماژەت بە کاریگەرییەکانی ئەمە کردووە لەسەر ئایین و نووسیوتە:" ژیانی کۆمەڵایەتی شتەکان پشت دەبەستێت بە رۆڵی ئەکتەرەکان تێیدا.

ماکێتی ئایین بەشێکە لە ماکێتی جیهانی". کەمێك لە بارەی کاریگەری گلۆبالیزەیشن لەسەر ئایین بە شێوەیەکی گشتی بدوێ.

ئۆلیڤەر روا:

بنەمایەکی سەرەکی هەیە بۆ ئەوەی کە لەوە دڵنیابین کە ئایین و کەلتورەکان پەیوەندییان بەیەکەوە هەیە. لە چەمکی "ململانێی شارستانییەتەکان"دا یاخود دیالۆگی نێوان شارستانییەتەکاندا، بیرۆکەی سەرەکی ئەوەیە کە هەر کەلتورێك چەندین جۆر لە رەگ و ریشەی ئایینی هەیە یان هەر ئایینێك گیان دەکاتەوە بە بەر کەلتورێکی دیاریکراودا. ئیستا چی روو دەدات گەر ئایین و کەلتور لەیەك جودا بکەینەوە.

تەماشای نمونەی "با خۆمان لاواز بکەین ". بکە. لە ئیسلامدا خواردن حەڵاڵ کراوە. ئەمەش رێگەیەك دەکاتەوە بۆ ئەوەی ئاژەڵ بکوژرێت و خواردن ئامادە بکرێت. حەڵاڵ وا پێناسە دەکرێت کە پەیوەندی هەیە بە خواردنە تەقلیدییەکانەوە، بەڵام ئیستا سەیر بکە، بۆ نمونە گەنجە موسوڵمانەکان کە لە ئەوروپا دەژین، گرنگی بە خواردنی نەریتی مەغریبی و تورکی و هەرجۆرێکی تری لەوبابەتە نادەن. کاتێك ئەوان کە لە چێشتخانەکاندا کار دەکەن ئەوان هەمیشە خواردنی خێرا دروست دەکەن، بەڵام لای ئەوان ئەو خواردنە حەڵاڵیشە. لەبەر ئەوە ئەوان ئەو بروایەیان لا دروست بووە کە خواردنی خێراش حەڵاڵە. بۆ نمونە ئیستا لە نزیك پاریس چێشتخانەیەك هەیە بە ئینگلیزی پێی دەوترێت" چێشتخانەی موسوڵمانان" و خواردنی خێرا دروست دەکات. کارمەندانی ئەو چێشتخانەیە بە زمانی خۆیان

بە زاراوەی خۆیان دەئاخافتن و خواردنی خێرای ئەمریکی دروست دەکەن، بەڵام بە رەفتاری ئایینییەوە، ئەو خواردنە لای ئەوان حەڵاڵە و کارمەندە مێینەکان بۆ نمونە پەچە دەپۆشن.

با نمونەیەکی ترت بدەمێ. بازرگانە موسوڵمانەکان لە فەرەنسادا کار لە مارکێتی مەککە کۆلا دەکەن. ئەوە دەقاودەق وەکو کۆکا کۆلا یاخود پیپسی کۆلا وایە. ئەمەش وەکو رێزێك بۆ شاری مەککەی سعودیەی عەرەبی. ئەمە وەکو ستایلێکی موسوڵمانان دەبینرێت. ئەمە هیچ پەیوەندی بە موسوڵمانانەوە نییە جگە لە وشەی "مەککە" نەبێت. ئەم کۆلایە زۆر سەرکەوتوو بوو لەنێو گەنجە موسوڵمانەکاندا بۆ هەرکەسێك بیویستایە راگەیاندنێك بکات یاخود بۆ فەزای گشتی و سیمبولی ئایینی بۆ ئەوەی پیشانی بدەن کە ئەوان موسوڵمانن، بەڵام لە هەمانکاتدا ئەوان بە شێوەیەکی گشتی بە خۆرئاواکراون، نەك بەوەی کە شیری حوشتر یاخود تەنانەت چایش بخۆنەوە. لەبەر ئەوە ئەوان خۆشحاڵن بەوەی کە بەرهەمێکی جیهانییان هەیە بە مۆرکێکی ئایینی.

کریسلەر:

وەك ئەوەی وتت، وە وەك ئەوەی من لە کتێبەکەتدا خوێندمەوە، دووبارەی دەکەمەوە کە مێژووی ئیسلام وەك ئەوەی کە دەستپێدەکات، کۆنتاکت دروست دەکات لەگەڵ کەلتورە لۆکاڵی و دابونەریتەکاندا دەبینرێت، گونجانی ئایین و پراکتیزەبوونی لەگەڵ ئەو کەلتور و نەریتانەدا. تۆ لەو بارەیەوە چی دەڵێیت وەك ئەوەی کە من وێنای دەکەم کە فەزایەکی نوێ و لەیەکچوو لەو نێوەندەدا روودەدات.

پرسیارەکە ئەمەیە، وەك ئەوەی تۆ جارێك بە کەسێکت وتبوو:" ئایا ئێمە دەتوانین مۆدێرنیتە بە ئیسلام بکەین؟".

ئۆلیڤەر ڕوا:

بەڵێ. لە مێژوودا هەموو ئایینەکان لەگەڵ کەلتورە جیاوازەکاندا بەریەککەوتنیان بەخۆوە بینیوە و لەگەڵ ئەو کەلتورە جیاوازانەدا خۆیان سازاندووە. ئەوە پرۆسەیەکی ڕاهاتنە بە ژینگە و دەوروبەر. ئایینی مەسیحییەتیش بە هەمان شێوەی ئایینی ئیسلام بەم قۆناغەدا تێپەڕیوە، کاتێك، بۆ نمونە، لە ئەفریقیا یان ئەمریکای لاتین ڕەگی خۆی داکوتاوە. بۆ نمونە ئیسلام کە گەیشتووەتە فارسەکان، کەلتورێکی نوێ لەو هەرێمە لە دایکبووە، کەلتوری ئیسلامی فارسی، کە ئیستا ئەو کەلتورە کەلتورێکی زۆر زیندووە.

ئیستا چی نوێ لە ئارادایە، لەڕاستیدا ئێمە لە پرۆسەی خولقاندنی کەلتوری نوێدا نین. ڕەمزە دینییەکان ئیستا خۆیان بە ڕەگ و ڕیشەی کەلتورێکی دیاریکراو نازانن. ئەوان خۆیان سەربەخۆ دەهێڵنەوە. ئەوە نەك تەنها لە ئیسلامدا، بەڵکو بۆ منی مەسیحیش هەمان جۆرە، بۆ نمونە، من بە تایبەتی لەسەر ئیڤێنجیلیکاڵیزم کار دەکەم. ئێمەش بەهەمان شێوە تاکگەرایی لە ڕموزە دینییەکانماندا هەیە. بڕوابوون چیدی ناتوانێ لەگەڵ کەلتورێکی دیاریکراودا ئاوێزان بێت. بێگومان ئەوە ڕێگەیەکە بۆ ئەوەی ببین بە کارەکتەری مۆدێرن، تەنانەت ئەوە ڕێگەیەکە وامانلێدەکات ببین بە خۆرئاوایی. لەبەرئەوە ئەم جیاکارییە

کەلتورییە لەنێوان ڕەموزە ئاینییەکانی ئیسلام و کەلتورە نەریتییەکانی عەرەب یان فارس مەرجێکە بۆ بە مۆدێرنبوون و بە خۆرئاواییبوون. بەڵام ئەمە بە مانای بوون بە لیبراڵی ئایینی نایات. لەبەر ئەوە بۆمن تاکە مەرجی مۆدێرنبوون بریتییە لە بە تاککەراییکردنی ئایین، نەك پێویستبوون بە لیبراڵیزەکردن بەرەو بەهای ئازادی، یان شتگەلێکی لەوجۆرە. تۆ دەتوانی کەسێکی فەندامێنتالیست و مۆدێرن بیت.

کریسلەر:

تۆ ئیش لەسەر جیاوازی دەکەیت، بۆئەوەی خەریکبیت بەوەی کە لەنێوان لە ڕادەبەدەر ئایینی religiosity و بڕوابوون بە ئایین جیاوازی هەیە. دەتوانی ئەمە شی بکەیتەوە؟

ئۆلیڤەر ڕوا:

ئایین جەستەیەکە. ئایین کتێب، تێکست، نەریت، تەفسیر و خواناسی و چەندین شتی لەو بابەتەیە. لە ڕادەبەدەر ئایینیبوون ڕێگەیەکە بۆ ئەزموونی تاکەکان لەسەر ئایین. لەبەرئەوە باوەڕداری ئایینی پەیوەندییەکی تاکەکسییە بە دینەوە. ئێمە پێویستە لەنێوان لە ڕادەبەدەرئایینیبوون و ئایینە جیاوازەکاندا فەزایەك بخولقێنین بەجۆرێك زاراوەی خوداناسی بوونی هەبێت، ئیستا بۆ دیالۆگ لەم بارەیەوە هیچ نەکراوە. لەبەر ئەوە ئێمە لەنێو خواناسەکاندا نزیکبوونەوە نابینین، بەڵام نزیکبوونەوە لای باوەڕداران هەیە بەڵام ئەو دیالۆگەی لەنێوانیاندایە هیچ نییە جگە لەوەی ئەو کەسە ڕاستە و ئەو کەسەیان هەڵەیە.

کریسلەر:

بە جۆرێك لە جۆرەکان، ئەوە مەسەلەیەکە پەیوەندی بە دیراسەی بەراوردکاری ئاینییەوە هەیە. هەمان شت ڕوو دەدات لە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ بیروباوەڕەکانی تردا. تۆ ئایدیای خۆت پەرە پێدەدەیت لە تاکگەرایی لە ئایینداا ئەمەش وەك باکگراوندێکی سەرەکی گلۆبالزەیشن، تۆ دەڵێی:" خود یاخود تاك سەنتەری ئایینە. بیروباوەڕ دیاردەیەکی تاکەکەسییە، باوەڕ بریتییە لە متمانە، باوەڕ ئایین نییە". ئەم دیاردەیە لە هەموو ئایینەکانی تردا ڕوو دەدات بە پلەی جیاواز.

ئۆلیڤەر ڕوا:

بەڵێ. بەتایبەت ئەوە هۆکاری ئەوەیە کە ئێمە دەڵێین دیاردەی "دووبارە لە دایکبوون". تاك دەتوانێ بە ڕاستی بگات، ئەمە نەك دوای ئەوەی بۆ چەند ساڵێك دیراسەی ئایین بکات، لە مەسەلەی ئایینناسیدا بڕوانامە وەربگرێت، گەیشتن بە ڕاستی بریتییە لە بەریەککەوتنی نێوان تاك و موقەددەس، موقەددەس ڕەنگە عیسای مەسیح بێت، ڕەنگە خودا بێت، ڕەنگە محەمەدی ئیسلام بێت، ڕەنگە شتگەلی جیاواز بێت. بەڵام ئەوە ئەزمونێکی تاکەکەسییە. ئەوە ئەنجامی بەشێك لە فێربوونی کەلتور نییە. لەبەر ئەوە بە پێناسەکردن، بە مانای بەریەککەوتنێکی دوورو درێژ دێت لەگەڵ دابڕان. دابڕان لەگەڵ خێزانەکەت، دابڕانێك لە ڕابردوو، لە ڕابردووی تاکەکەسی تۆ، بەڵام هەروەها ڕابردووی کۆمەڵگەکەت، دابڕان لەگەڵ مێژوو. تاکگەرایی بە مانای کارەکتەرێکی نوێ لەگەڵ ڕاستی. تاکەکەس هەڵگری

ڕاستییە. لەبەر ئەوە ئەم پرۆسەی بە تاککردنە فۆرمێکە لە ناو دڵی فۆرمگەلێکی نوێی ئایین.

کریسلەر:

دووبارەی دەکەمەوە، دیاردەیەکی تر هەیە ئەویش لە هەرێمخستنی تاکە. لەبەر ئەوە ئەوان تەنها لە پەیوەندی خێزان و کۆمەڵگە دانابڕێن، بەڵکو لەو خاکەی کە لێی لە دایکبوون، دادەبڕێن.

ئۆلیڤەر ڕوا:

بەڵێ.ئەوە بە مانای کۆرەوی دەستەجەمعی نایات. ئەوان باوەری کۆمەڵگە پێکدەهێنن، وە باوەری کۆمەڵگە شتێك نییە تایبەت بە هەرێمێکی دیاریکراو. ئەم پرۆسەیە لە هەموو ئایینێکدا ڕوودەدات. بۆ نمونە، پێشتر، ئایینی مەسیحی لە ناوچەیەکی قەشەنشیندا ناوچەی قەشەنشین ئەو ناوچەیە بوو کە تۆی تێدا دەژیای. ئیستاش ئەو ئایینەی هەموومان کۆ دەکاتەوە، تەنها پابەند نییە بەو ناوچەیەی کە ئێمەی تێدا دەژین. تۆ دەتوانی بە ئۆتۆمۆبیلەکەت، یان بە چەندین مانای جیاواز، بڕۆیت و خەڵکانێکی تر ببینیت، کە تۆ بڕوات وایە برای دینی تۆن. تۆ دەتوانی بە ئینتەرنێت شوێنی دوور ببینیت، تۆ دەتوانی بە ئینتەرنێت چات بکەیت و تەنانەت لەگەڵ براکانتدا نوێژ بکەیت، هەموو ئەو برا دینیانەش ببینیت کە لەگەڵ تۆدا شوێنکەوتەی یەك ئایینن.

لەبەر ئەوە ئێمە ئیستا لە سەردەمی تێکشکانی هەرێمایەتی بیروباوەری کۆمەڵگەداین، ئەمەش دوور دەکەوێتەوە و زاراوەگەلی

سیاسیش لەخۆ دەگرێت. بۆ نمونە، گەر ئێمە لە ڕادیکاڵەکان بڕوانین، وەکو شوێنکەوتوانی گروپی ئەلقاعیدە، بە جیاواز لە بۆچوونی زۆرێك لە خەڵك، دەڵێم ئەوان شەڕ بۆ دروستکردنەوەی خەلافەتی ئیسلامی لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا ناکەن. ئەوان لەسەر ئاستێکی جیهانی شەڕ دەکەن وەك ئەوەی خۆیان ناوی دەنێن دژ بە دوژمنێکی جیهانی. ئەوان گرنگی بە ناوچەیەکی دیاریکراو نادەن. لەبەر ئەوە ئەمە دیاردەی لە هەرێمخستنە، دەتوانم بڵێم لە هەناوی زۆرێك لە ئایینەکانی ئەم سەردەمەدا بوونی هەیە و ڕاهێنراوێکی تەواو سیاسیشە.

# ئیسلام و ئوممە

کریسلەر:

سەپتایتڵی کتێبەکەت، کە دواتر دەچینەوە سەری بریتییە لە "گەڕان بۆ ئوممەیەکی نوێ". یارمەتیمان بدە تاکو تێبگەین مەبەست لە ئوممە چییە و گەڕان بەدوای ئوممەیەکی تردا بە چ مانایەك دێت؟

ئۆلیڤەر ڕوا:

ئوممە بریتییە لە کۆمەڵگەی بـــاوەڕدارە موسوڵمانەکان. بە شێوەیەکی گشتی لە مێژووی موسوڵماندا، ئوممە لەگەڵ ناوچەیەکی دیاریکراودا پێناسە دەکرا، ئەو ناوچەیەی کە ئیسلام تێیدا جێگیر بوو، وە موسوڵمان لەو بڕوایەدا نەبوو کە بە درێژایی ژیانی بمێنێتەوە لە وڵاتێکدا، کە بەشێك نەبوو لە هەرێم و ناوچەی ئوممە. وەك چۆن ئیستا دۆخێکە ناتوانین چیتر قسە لەسەر زاراوەگەلی هەرێمێکی دیاریکراو بۆ ئیسلام بکەین، نەك تەنها لەبەرئەوەی بە ملیۆنان موسوڵمان وەك کەمینە لە وڵاتە ناموسوڵمانەکاندا دەژین، بەڵکو لەبەرئەوەی زۆرێك لە باوەڕداران بڕوایان وایە کە ئەو وڵاتەی خۆیان کە پێی دەڵێن وڵاتی موسوڵمانان،چیتر وڵاتێکی ئیسلامی نییە.

ئێمە هەمان دیاردە لەنێو پیوریتانەکان و زۆرێك لە موسوڵمانەکاندا دەبینین، کە ئەو بۆچوونەیان هەیە، لەڕاستیدا ئەوان کەمایەتییەکی بچوکن لە باوەڕداری ڕاستەقینە کە خەڵکانێکیان لەدەورە بڕوایان بەم بۆچوونە نییە، تەنانەت ئەگەر ئەوان کەمینەیەکی موسوڵمان یاخود مەسیحی بن. باوەڕدارە ڕاستەقینەکان لە ئیستەدا بڕوایان وایە کە خۆیان بوون بە کەمینەیەکی ناهەرێمی. ئەم هەوڵە بریتییە لە بنیادنانی کۆمەڵگەیەکی پراکتیکی بیروباوەڕ، کە هەرگیز پەیوەندی بە هەرێمێکی دیاریکراوەوە نییە. لەبەرئەوە، کۆمەڵگەیەك بۆ فریشتە و پیاوچاکان، کۆمەڵگەیەك بۆ باوەڕداران، هەردوو پرۆتیستانیزم و ئیسلامی سەلەفی لە دەرەوەی هەرێمێکی دیاریکراون، بەڵکو هەمیشە ئەوان بوونێکی جیهانییان هەیە لەبەرئەوەی هەرێمێکی

دیاریکراویان نییە.

کریسلەر:

ئێوە لێکۆڵەرەوەیەکن لەبارەی ئیسلام و لە کارەکانتاندا ململانێ لەناو خودی ئیسلامدا دەبینرێت. لە کتێبەکەتدا تۆ باس لە سەرهەڵدانی دوو گروپ دەکەیت، ئیسلامیستەکان و فەندامێنتالیستەکان. با باس لەو گروپانە بکەین، لە ئیستادا، پێویستە تێبەگەین کە ئەوان کێن و چۆن دەتوانن کاریگەریی خۆیان لەسەر گلۆبالیزەیشن جێبهێڵن، بەهۆی کردەوەکانیانەوە. ئیسلامیستەکان کێن و بیروباوەڕی ئەم گروپە چییە؟

ئۆلیڤەر ڕوا:

ئیسلامیستەکان خەڵکانێکن بڕوایان وایە کە ئیسلام، یەکەم: ئایدۆلۆجیایەکی سیاسییە. لەبەرئەوە، دامەزرێنەرانی ئیسلامیزم، لەوانە حەسەن ئەلبەننا و مەودودی، زۆر لەژێر کاریگەری ئایدۆلۆجیا سیاسییەکانی سەدەی بیستەمی خۆرئاوادابوون، بۆ نمونە مارکسیزم (بێگومان ئەوان مارکسیست نەبوون)، بەڵام ئەوان دواجار بڕوایان وابوو کە ئیسلام تەنها ئایین نییە، تەنها سیستەمێکی یاسایی نییە، بۆیە پێویستە ببێتە سیستەمێکی سیاسی ڕاستەقینە. لای ئیسلامیستەکان دەوڵەت سەرەتایەکە بۆ بە ئیسلامکردنەوەی کۆمەڵگە. لەبەرئەوە ئەوان جەخت لەسەر بزوتنەوەی سیاسی دەکەنەوە، وە گرتنە دەستی دەسەڵاتی دەوڵەت، بۆ بنیادنانی دەستورێکی ڕاستەقینەی ئیسلامی، ئابورییەکی ڕاستەقینەی ئیسلامی، عەدالەتی کۆمەڵایەتی ئیسلامی.

بۆئەم مەبەستە ئەوان لە زانستە کۆمەڵایەتییەکان و کۆمەڵگەی مۆدێرن زۆر سودمەندبوون، لەوانە بۆ نمونە ژنان. ئیسلامیستەکان یارمەتی رێکخراوەکانی ژنان و بزوتنەوەکانی ژنانیاندا، وە هەمیشە ئەوان بڕوایان وایە کە ژنان دەتوانن کار بکەن و پێویستیشە کار بکەن، وە(هەرچەندە گرانە) دەتوانن پۆستی سیاسییان هەبێت، وەك ئەوەی ئیستا لە ئێراندا دەبینرێت.

لەبەرئەوە ئێمە دەتوانین بەراورد لەنێوان ئیسلامیزم و کۆمۆنیزمدا بکەین. یەکەم، ئیسلامیستەکان هەوڵی دروستکردنی دەوڵەتێکی ئیسلامی و کۆمۆنیستەکانیش هەوڵی دروستکردنی دەوڵەتێکی سۆسیالیستی دەدەن، ئەمەش لە وڵاتێکی جیاوازدا، وە هەردوولا هەوڵی یەکخستنی وڵاتی ئیسلامیست یان سۆسیالیستەکان دەدەن لە سیستەمێکی سیاسی جیهانیدا، بەرەو ئیسلام یان کۆمۆنیزم. هەمان شت لای ئیسلامیستەکان و کۆمۆنیستەکان ڕوودەدات. لەڕاستیدا، هەردوولا دەیانەوێت دەوڵەت کۆنترۆڵ بکەن، وە لەڕاستیدا، هەردوولا دەبن بە سیاسییەکی ئاسایی، گەر بتوانم بڵێم هەم ئیسلامیستەکان و هەم کۆمۆنیستەکان بوون بە ناسیۆنالیست.

ڕوونترین نمونەش شۆڕشی ئێرانییەکانە. شۆڕشی ئێرانییەکان بەڵێنەکانی خۆی لە یەکسانی کۆمەڵایەتی و عەدالەتی ئابووری بەجێ نەهێنا. دەوڵەتی ئێران هەمان دەوڵەتی کلاسیکی جیهانی سێیەمە لە بواری ئابووری و نەوت و مەحسوبییەت و ڕەشوە و گەندەڵی، ئەمەش وەکو هەر کۆمەڵگەیەکی تر لە بواری بەڕێوەبردندا. لەبەرئەوە، من دەتوانم ناوی بنێم شکستی ئیسلامی سیاسی. ئەوان شکستیان هێنا

لە بنیادنانی دەوڵەتێکی ڕاستەقینەی ئیسلامیدا.

ئیستا ئەوان لەبەردەم هەڵبژاردنی دوو ئاراستەدان. یەکەم دەکرێ بڵێم" ئێمە پێویست نییە جەخت لەسەر دەوڵـەت بکەینەوە، پێویستە بۆچوونێکی جیهانیمان هەبێت" وەك ترۆتسکییەکانی مێژووی کۆمۆنیزم." ئێمە پێویستە لەگەڵ جیهاندا بەرێکەوین، ببین بە پرۆفیشناڵ، جیهانبینی فراوانمان هەبێت و ڕێکخراو لە هەرێمی چەقبەستوو قوتار بکەین". وەك ئەوەی ڕێکخراوی ئەلقاعیدە لەسەری دەڕوات.

دووەم دەتوانم بڵێم" ئێمە ناتوانین دەوڵەتێکی ئایدۆلۆجی دروستبکەین، بەڵام ئەگەر بمانەوێت دەوڵەت بەڕێوەبەرین، ئەگەر بمانەوێت سیاسی بین، پێویستە هاوپەیمانی لەگەڵ خەڵکانی تردا پێکبێنین، پێویستە بەشداری هەڵبژاردن بکەین، وە پێویستە دیموکراسی قبوڵ بکەین". ئەم ڕێگەیە تەواو زیندووە، بۆ نمونە، سەرۆك وەزیرانی تورکیا، ڕەجەب تەیب ئاردۆگان، ئەو کە خوێندکار بوو، ئیسلامیستێکی توندڕەو بوو، بەڵام دوای دە ساڵ لە ئەزموونی سیاسی و سەرۆکی شارەوانی ئەستەنبوڵ، گەیشتە ئەو ڕاستییەی کە ئەو ئایدۆلۆجیایە هەرگیز کۆمەکی ناکات. بێگومان، ئەو دەیویست کار لەسەر بەها دیاریکراوەکان بکات، ئاردۆگان پیاوێکی ئیمانداره. بەڵام ئەو بۆتە پیاوێکی موسوڵمانی یەکسانیخواز، وەك" مەسیحییەکی دیموکراسی"، دەمەوێ بڵێم، ئەو کاری لەسەر بەهاکان و بەها ئایینی و تەقلیدییەکان دەکات، بەڵام دەقاودەق یاساگەلی گەمە دیموکراتییەکانی قبوڵە.

لەبەرئەوە، دەتوانم بڵێم ئیسلامیستەکان یەك خیاریان هەیە، لەنێوان تورکیای ئیستا و تاڵیبانی ئەفغانستاندا. گەر ئێمە بتوانین ئیسلامیستەکان لە کایەی سیاسیدا کۆبکەینەوە، ئێمە یارمەتییان دەدەین بۆ بروابوونیان بە دیموکراسی و دەتوانین شتێك بکەین کە ئەوان لانی کەم وەك ئیسلامیستەکانی تورکیا دیموکراسی قبوڵ بکەن. گەر ئێمە ئیسلامیستەکانمان لە کایەی سیاسی ڕەت کردەوە، ئەوا پاڵیان پێوە دەنێین کە وەك تاڵیبان چەك هەڵگرن.

کریسلەر:

کەمێك لەبارەی ئەزموونی تاڵیبانەوە بدوێ. چ پەیوەندییەکی هەیە بە دەوڵەتەوە؟ ئایا ئەوان دەوڵەتیان دروست کرد و دواتر نەیانتوانی بیپارێزن؟

ئۆلیڤەر ڕوا:

تەواوە، تەواوە. ئەوە زۆر گرنگە، بۆ نمونە، مەلا محەمەد عومەر، سەرۆکی تاڵیبان، هەرگیز نەدەچوو بۆ کابولی پایتەختی ئەفغانستان. ئەو هەرگیز سەرۆکی کابینەی حکومەتی وەرنەدەگرت. ئەو بینینی هەر باڵیۆزێکی ناموسوڵمانی ڕەت دەکردەوە. ئەوە گرنگە، لەبەرئەوەی تاڵیبان هەوڵی بازاڕی ئازادی دەدا. ئەوان هەرگیز بەهێز هیچ شتێکیان نەدەسەپاند، بەتایبەت باج و سەرانە. ئەوان گرنگییان بەوە نەدەدا. بۆنمونە، بۆیە ئەوان زۆر لەگەڵ خەڵکدابوون، لەناویاندا چینی بازرگانەکان. ئەوان تەنها باجی ئاینیان دەسەپاند لەسەر خەڵك و دواتر بازاڕی ئازاد، ئازاد بە هەموو مانا. ئەوان

یاسایەکیان نەبوو بۆ بەڕێوەبردن، جگە لە فەرمانە ئاینییەکان، بۆ نمونە، جلوبەرگ، "سنووردارکردن"ی ژنان و شتی لەو بابەتە. بە هەموو مانایەك بێگومان، ئەو فەرمانە ئایینیانە زۆر دڵڕەقانەبوون، هەر ئەوەش وادەکات کە تاڵیبان نادیموکرات بێت. بەڵام ئەو وڵاتە تۆتالیتار نییە.

با نمونەیەك بێنینەوە، پشکنینی ماڵان. کاتێك تۆ دەوڵەتێکی تۆتالیتارت هەیە، بێگومان لە هەرکاتێکدا بتەوێت گەرانی ماڵان ئەنجام دەدرێت. بۆ نمونە لە ئێران، ئایەتوڵڵایەك" خومەینی نەبوو" ڕایگەیاند پشکنینی ماڵان حەڵاڵ نییە، لەبەرئەوە یاسای ئایینی جێبەجێ مەکە، لەبەرئەوەی ئەگەر تۆ پۆلیسی نیشتمانیت لەشەودا نارد بۆ ماڵێکی تاکەکەسی، ئەو پۆلیسە ڕەنگە ژن ببینێت بەبێ حیجاب، یان ڕەنگە هەر جلیشی لەبەردا نەبێت، لەبەرئەوە ئەو کەسە بە جێبەجێ کردنی ئەو فرمانە توشی گوناه دەبێت. ئەو پۆلیسە ڕەنگە ئازادی خۆی بخاتە مەترسییەوە بەهۆی ئەرکە حکومیەکانەوە، لەبەرئەوە باشترە پشکنینی ماڵان قەدەغە بکرێت. خومەینی زۆر بە توندی وتی نا پشکنینی ماڵ پێویستە و یاسای دەوڵەت بالاترە لە شەریعەت، لەبەرئەوەی دەوڵەتەکە ئیسلامییە. بەڵام تاڵیبان پشکنینی ماڵانیان حەرام کردبوو، ئەمەش لەبەر هۆکارە ئاینییەکان.

لەبەرئەوە، لەڕاستیدا تۆ ئەوە دەبینی، کە تاڵیبان گرنگییان بە بنیادنانی دەوڵەت نەدەدا. لای ئەوان ئامانج لە سەرکردە سیاسییەکان نەك تەنها حوکم بکەن، بەڵکو فشار بخەنە سەر خەڵك بۆئەوەی بیر لە ڕزگاری تاکەکەسی بکەنەوە. لەبەر ئەوە تاڵیبان ڕژێمێکی تەواو ئایینی

بوو نەك دەوڵەتێکی ئایدۆلۆجی. لە ڕاستیدا هەر ئەوەش بوو تاڵیبان دەسەڵاتەکەی رووخا، لەبەر ئەوەی کاتێك مەلا عومەر کەوتە بەردەم خیارێکەوە، کاتێك ئەمریکییەکان لە ئێوارەی ١١ی سێپتەمبەر بەرەنگارییان ڕاگەیاند و بە مەلا عومەریان وت:" تۆ ٢٤ سەعاتت هەیە بۆ ئەوەی بنلادنمان ڕادەست بکەیت، ئەگەرنا لێتدەدەین". هەر پیاوێکی دەوڵەتی تر بوایە، ڕازیدەبوو بە ڕادەستکردنی بنلادن، لەجیاتی ئەوەی هەموو دەوڵەتەکە بڕوخێ. بەڵام مەلا عومەر توشی گومان نەبوو، نا هەرگیز. ئەو لایەنگری بنلادنی کرد و دەوڵەتەکەی لەدەستدا، بەبۆچوونی ئەو وڵاتەکەی لەدەستدا.

کریسلەر:

یارمەتیمان بدە بۆ تێگەیشتن لە شکستی وەهابییەکان، لەبەرئەوەی لەڕاستیدا پیشاندانی بۆچوونی تۆیە لەبارەی بیروباوەڕ و جیابوونەوەی لە هەر کەلتورێك؟

ئۆلیڤەر ڕوا:

بەڵێ. ئەوە گرنگە کە ئەفغانستان هەمیشە بووە کۆمەڵگەیەکی بەهێزی کۆنزێرڤاتیڤی ئیسلامی، بەڵام لە سەدەکانی شازدە، دەسەڵاتی ئیسلامی لە ئەفغانستان، کاتێك بوو کە بوودییەکان نەڕوخابوو. ئەوە شتێکی تەواو نوێیە. بودییەکان لەلایەن کۆمەڵگەی ئەفغانی و دەسەڵاتەکانی ئەفغانییەکانەوە لە سەدەکانی شازدەدا قبوڵ دەکرا، بەڵام یەکسەر تاڵیبان هاتە سەر دەسەڵات و هەموو ئەمانەی ڕوخاند. ئەمە دوو ڕەهەند لەخۆ دەگرێت. یەکەمیان بریتیی بوو لە مۆتیڤی

سیاسی بۆ پیشاندانی خۆرئاواییەکان کە ئەوان ناتوانن شەڕ بکەن. بەڵام مۆتیڤی دووەم زۆر گرنگە. مەلا عومەر ڕایگەیاند:" سەیرکە، بودییەکان، نە کەلتوریان هەیە و نە ئایین. وە گەر کەلتوریان وەربگرین، ئەوا هیچ گرنگییەکی نییە، کەلتور شتێك نییە بەرامبەر بە ئایین شوێن چۆڵ بکات. بودایزم بریتییە لە ئایینی بودییەکان. ئایا ئێمە لە ئەفغانستان بودیستمان هەیە؟ نەخێر ئێمە بودیستمان نییە، لەبەرئەوە لەم مەسەلەیەدا بوداییەکان هیچ گرنگییەکیان نییە لای ئێمە". بۆیە ئەوە نمونەیەکی ڕوونە بۆ جیاکاری لەنێوان کەلتور و ئاییندا. هەربۆیە مەلا عومەر دەیوت:" ئێمە گرنگی بە ئایین دەدەین، نەك بە کەلتور".

کریسلەر:

ئیستا دووەمین لێشاوی بیرکردنەوە، یان گروپ لەناو ئیسلامدا، کە تۆ گرنگی پێدەدەی بەوەی کە ناویدەنێی فەندامێنتالیستی نوێ. کەمێك لەبارەی ئەمانەوە بدوێ، وە ئەوان چۆن دەتوانن وەك سیمبوڵ خۆیان وێنا بکەن؟

ئۆلیڤەر ڕوا:

فەندامێنتالیستە نوێیەکان... کە دەتوانم بڵێم سەلەفییەکان و وەهابییەکان و هەندێکی ترن. ئەوان بزوتنەوە و گروپی جیاوازن، من ناچمە ناو ئەو وردەکاریانەوە. بەڵام فەندامێنتالیستە نوێیەکان وەك ئەوەی من پێیان دەڵێم، خەڵکانێکن وا بیردەکەنەوە کە کۆمەڵگە دەبێت بەتەواوی ببێتە ئیسلامی، یان لانی کەم دەبێت ئەندامەکانیان

بەگشتی موسوڵمان بن. ئەوان وابیردەکەنەوە کە دەبێت بەر لەهەرشت تاکەکان بە ئیسلام بکرێن، لەبەرئەوە ئەوان جەغت لەسەر رزگاربوون و ڕۆژی دوایی دەکەنەوە. لای ئیسلامیستەکان رزگاربوونی ڕاستەقینە بریتی بوو لە بنیادنانی دەوڵەتێکی ئیسلامی ڕاستەقینە، بەڵام لای فەندامێنتالیستەکان دەوڵەت هیچ گرنگییەکی نییە. بابەتەکە رزگاربوونی تاکەکەسییە، وە بۆ ئەم مەسەلەیە، ئەوان تەواو ڕەشبینن، وەکو گەیەنەرە مەسیحییە ڕەشبینەکان. بەبۆچوونی ئەوان کەمینەی خەڵك ڕاستن و لە سزاکانی خودا قوتاریان دەبێت، بێگومان ئەوان وا بیردەکەنەوە کە سەر بەو کەمینەیەن. لەبەرئەوە بۆ ئەوان ئەوە شتێکی تەواو بێمانایە بۆ ئەوەی شەڕی لەسەر بکرێت، بۆ ئەوەی کۆمەڵگە یاخود دەوڵەتێکی دیاریکراو بە فۆرمە ئایینییەکان پاکسازی بکرێت. " ئەمە ڕۆژەکەیە، ئێمە پێویستە ئامادەبین، وە ئێمە پێویستە ژیانی تاکەکەسی خۆمان بگۆڕین"، ئەمە یەکێك بوو لە خاڵەکان.

دووەمین خاڵ مەسەلە ئاینییەکان گەورەترین نۆرم لەخۆ دەگرێت: ئێمە پێویستە ئەوە بکەین و ئەمە بکەین، ئێمە پێویستە بەم جۆرە جل بپۆشین، ئێمە پێویستە بەم شێوەیە خواردن بخۆین. ئەوان سەرقاڵی نۆرمەکان بوون لەجیاتی خەریکبوون بە بەهاکانەوە، لەبەرئەوە ئەوان هەوڵ دەدەن ڕێگەیەکی تەواو پێوانەیی بۆ ژیان دیاری بکەن. تاڵیبان بە هەموو مانایەك پڕ بەم جۆرە تێڕوانینەیە. بۆ نمونە، سیاسەتی ئایینی ئەوان ناچارکردن بوو کە خەڵك لەکاتی خۆیدا نوێژ بکات. لەم بارەیەوە، ئەوان هەوڵ دەدەن بە زۆر وا لەخەڵك بکەن وەك ئەوان بیر بکەنەوە، بەڵام ئەوان لە مۆتیڤەکانی دڵنیا نین.

سێیەمین خاڵ ئەوەیە کە فەندامێنتاڵیستە نوێیەکان، وەکو هەموو فەندامێنتالیستەکانی سەردەم، وا بیر دەکەنەوە کە ئەوان کەمینەن لە کۆمەڵگەیەکدا کە بە عەلمانیکراوە، گەندەڵە، تەنانەت ئەگەر ئەو کۆمەڵگەیە کۆمەڵگەیەکی موسوڵمانیش بێت. ئەوان وا کەلتور دەبینن کە دوژمنی ئایینە. بۆ نمونە، ئەوە زۆر دیارە کە زۆرێك لە سەلەفییەکانی سعودیەی عەرەبی، وەکو پیاوێکی ئایینی هەڵگری حەقیقەت قسە دەکەن. ئەوان دەڵێن:"ئێمە پێویستە باوەرداری نۆرماڵ بین، کۆمەڵگەکەمان دەبێت کۆمەڵگەیەکی موسوڵمان بێت، بەڵام لەراستیدا کۆمەڵگەکەمان بە شێوەیەکی کەلتوری کۆمەڵگەیەکی عەلمانییە. بە سروشت گەندەڵە، تەنانەت ئەگەر زۆرینەی خەڵکیش خۆیان وا پیشان بدەن کە باوەردارن". لەبەرئەوە، ئەوان بروایان وایە کە ئایین و کەلتور دوژمنی یەکن. ئەوان دەڵێن پێویستە دەسبەرداری کەلتور بین بۆ ئەوەی باوەردارە راستەقینەکان بمێننەوە.

فەندامێنتاڵیستە نوێیەکان بەجۆرێك لە جۆرەکان، ئەکتەرن لە پرۆسەی بە جیهانیبووندا، لەبەرئەوەی ئەوان بەشدارن لە کەلتورخستنی ئاییندا، وە ئەو ئایینەی کە ئەوان یارمەتیدەرین، دەتوانم بڵێم هەمان فۆرمی بازاری جیهانییە. بۆیە دەتوانێ بە مارکێت بکرێت، گەر زیادەرۆییم نەکردبێت، وەك بەرهەمهێنانێکی یونیڤێرساڵ لە هەموو شوێنێکی جیهاندا.

# فەڕەنسا و حیجاب

کریسلەر:

با نمونەیەکی دیاریکراو بهێنمەوە: کێشەیەك هەبوو لە فەڕەنسا سەبارەت بە باڵاپۆشی ئیسلامی لەنێو خوێندکاراندا لە فەزای گشتیدا گرنگی پێدرا. کەمێك لەو بارەیەوە بدوێ ئەوە چۆن ڕوویدا و پێگەی فەندامێتاڵەکان لە فەڕەنسا لەسەر ئەم کێشەیە چییە؟

ئۆلیڤەر ڕوا:

یەکەم شت ئەوە بوو کە زۆرینەی کچە خوێندکارەکان ڕۆژێك بەیەکەوە حیجابیان پۆشی و چوون بۆ قوتابخانە، ئەوان بەگشتی بە خۆرئاواکراون، فەرەنسی بوون، ئەوان هەموو خوێندەوار بوون و پلەی زانستی بەرزیان هەبوو، کچە خوێندکاری باش بوون و پلەی زانستی بەرزیان هەبوو. ئەوان لەسەر بنەمایەکی خۆبەخشانە حیجابیان پۆشیبوو، ئەوان لەلایەن خێزان و دایك و باوکیان یاخود براکانیانەوە فشاریان لەسەر نەبوو تاکو حیجاب بپۆشن، یان هەر فشارێکی لەو بابەتە. وەك ئەوەی بینرا لەلایەن ڕای گشتییەوە تەفسیرێکی ئابڕووبەرانەی بۆ کرا.

کریسلەر:

لە فەرەنسا؟

ئۆلیڤەر ڕوا:

بەڵێ، لە فەرەنسا. " ئێوە چۆن دەتوانن بە خۆبەخشانە دەستبەرداری ئازادی بن، ئێوە چۆن دەتوانن بە خۆبەخشانە لە دنیای بچوکی ئایینداخۆتان دابخەن، لە بوون بە ئافرەتی ئازادی مۆدێرن کۆسپ بهێننە سەر ڕێگەی خۆتان؟". ئەمە ئەو قسانە بوون کە ڕای گشتی فەرەنسا بە ئافرەتە باڵاپۆشەکانیان دەوت. هەروەها ڕای گشتی فەرەنسا وا ئاماژەیان بۆ ئەم باڵاپۆشییەی خوێندکاران دەکرد کە کەلتورێکی تەواو تەقلیدییە. بەڵام بە شێوەیەکی ڕەها ئەوە کێشەکە نییە. لە بەرامبەردا ئەم کچانە دەیانویست ببن بە کچی مۆدێرنی خۆرئاوا بەڵام بە مارکەرێکی ئایینیانە لەسەریان. ئەوان دەیانویست ناسنامەی

ئایینی خۆیان نیشان بدەن، هەڵبژاردنی ئایینی تاکەکەسی خۆیان، بەبێ فشاری ئەوانی دی.

ئەوە زۆر گرنگە کە ئێمە دەبینین ئەوان زاراوەی فێمینیستی بەکار دەهێنن، بۆ نمونە، بۆ بانگێشتکردنی مافەکانیان حیجاب دەپۆشن، خۆ کەس زۆری لێنەکردوون حیجاب بپۆشن. دروشمەکانیان بریتی بوو لە :" دەربەستی جەستەمان دەبین، بەتەنگ جەستەمانەوە دێین". لە پشتبەستن بەم دروشمە فێمینیستییە تەقلیدییە، گرنگی تەواویان بە پۆشینی حیجاب دەدا، بزوتنەوە فێمینیستییەکان بەم کردەوەیە دابەش بوون بەسەر دوو بەرەدا. زۆرینەی فێمینیستەکان بەم باڵاپۆشییە توشی شۆك بوون، لە کاتێکدا کەمینەی فێمینیستەکان دەیانوت:" ئۆکەی، تەماشاکەن ئەو کچانە چییان دەوێت وادەکەن، ئەوان ئازادن، ئەوە رێگەیەکە تا بتوانن وەك تاکەکەس خۆیان بنوێنن، ئەوە دیاردەیەکی شارستانی نییە، ئێمە دەبێت باڵاپۆشی قبوڵ بکەین، تەنانەت ئەگەر دژیشی بین".

لەبەر ئەوە، تێنەگەیشتنێکی گەورە لەو بارەیەوە هەستپێدەکرا. بەبێ بیرکردنەوە لەوەی کە ئەوە هۆکارێکە بۆ پراکتیزەکردنی ئایین بە شێوەیەکی تاکەکەسی، زۆرینەی رای گشتی فەرەنسا ئەم باڵاپۆشییەی کچانیان وادەبینی کە سەرەتایەکە بۆ ململانێی شارستانییەتەکان. لەبەر ئەوە پشتگیرییەکی گەورەی پەرلەمانیش هەبوو بۆ رای گشتی فەرەنسا، تاکو باڵاپۆشی کچان لە قوتابخانەکاندا قەدەغە بکەن.

# پرۆفایلی ئیسلامییە تیرۆریستەکان

کریسلەر:

یارمەتیمان بدە بۆ تێگەیشتن لەو هەموو گۆڕانانە لە کۆمەڵگەی جیهانیدا، وەك گۆڕانەکانی دنیای ئیسلام. پرسیارەکە دەبێتە ئەمە: کێن "تیرۆرستەکان" کە بوونەتە "مرۆڤگەلێکی ئەفسانەیی"؟

ئۆلیڤەر ڕوا:

یەکەمین دەرکەوتەی تیرۆرستان، لە دوای یازدەی سێپتەمبەر ئەو گەنجە بێگانانە بوون کە لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستەوە هاتبوون، بۆ ئەوەی قەیرانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بگوازنەوە بۆ خۆرئاوا. ئەوە هەستی دەوڵەتان بوو، هەروەها ئەوروپاش، دوای ئەوەی کەوتنە بەر گەمارۆ و لێدانی شارستانییەت و کەلتورە جیاوازەکانی دەرەوەی خۆیانەوە. بەڵام لەڕاستیدا، ئەگەر ئێمە تەماشای باکگراوندی تیرۆرستان بکەین، ئێمە دەزانین ئەوان کێن، ئێمە سەدان ناومان هەیە بۆ ئەوان، تیرۆرستەکان، بکوژەکان، هەڵاتووەکان، ڕاکردووەکان. ئێمە بە سەدان و سەدان ناومان هەیە، بەڵام لەهەمووی گرنگتر ئەوەیە کە زۆرێك لەوان باکگراوندێکی خۆرئاواییان هەیە. ئێمە گرنگە یەك شت بزانین، بۆ نمونە، فەلەستینییەك، عیراقییەك، ئەفغانییەك نییە، سزا بدرێت لەسەر ئەوەی چی لە وڵاتەکەیدا ڕوویداوە، یان شەڕی کردبێت دژ بە خۆرئاوا. نەخێر، ئەو گەنجانە لە باکگراوندی هەرێمێکی دیاریکراو داماڵراون. بۆ نمونە، ڕەنگە ئەوان لە وڵاتێك لە دایکبووبن، دواتر لە وڵاتێکی تر پەروەردەکرابن، دواتر بۆ شەڕ چوبێتنە وڵاتێکی تر، وە ڕەنگە لە وڵاتێکی تر مافی پەنابەرێتییان وەرگرتبێت. بەو شێوەیە کەس لەوان باکگراوندێکی ئایینی نییە. کەس لەوان لە خێزانێکی تەواو نەریتپارێزدا لە دایك نەبوون. هەموو ئەوان جارێکی تر لە دایکبوونەتەوە، هەموو ئەوان یان لانی کەم زۆرێك لەوان گەنجن، وە ئەوان چوونە نێو فەندامێنتالیزمەوە و لە هەمان کاتدا چوونە نێو بزوتنەوە سیاسییەکانەوە. بۆیە، ئەوە پرۆسەیەکی درێژخایەنی بیروباوەڕ پێگۆڕینی ئایینی نییە بەرامبەر بە گەنجان و منداڵانی

قوتابخانە. ئەو پڕۆسەیە تاسەر بەردەوام نابێت.

ئەو گەنجانە جارێکی تر لە دایکدەبنەوە، وە یەکسەر بڕیار دەدەن لەسەر شتە ڕاستەقینەکان، کارێك دەکەن کە دەنگدانەوەی لەسەر جیهان دەبێت، شتگەلێك کە بەتەواوی دەبینرێت، کە هەمان ڕۆژ لەسەر شاشەکانی تەلەفزیۆن دەبینرێت. ئەوان گرنگی بە شەڕی پارتیزانی نادەن، ئەوان گرنگی بە ئەکتیڤکردنی گشتی و سەرتاباگیر نادەن، لە دروستکردنی پارتی سیاسیدا، یاخود پڕوپاگەندەکردن لای ئەوان گرنگی ئەوتۆی نییە. ئەوان گرنگی بە تەلەفزیۆن دەدەن، بەوەی کە هەواڵەکان بە زویی بگوازێتەوە.

ئەو گەنجە تیرۆرستانە لە فەزایەکی جیهانیدا دەژین. بۆنمونە، زۆرێك لەوان، فڕۆکەوانەکانی سەنتەری بازرگانی جیهانی، لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستەوە هاتبوون بەڵام لە ئەڵمانیا خوێندویانە و پەروەردەبوون. ئەوان وەك موسوڵمانێك جارێکی تر لە ئەڵمانیا لە دایکبوونەوە، نەك لە میسر و لوبنان، وە بڕیاریاندا لە ئەفغانستان مەشق بکەن، و دواتر بڕۆن بۆ نیویۆرك بۆ ڕوخانی سەنتەری بازرگانی جیهانی. لەناو ئەو گەنجانەدا، لەناو هەموو ماڵپەڕەکاندا، کارەکتەری هەڵگەڕاوە دەبینین.

ئەوە شتێکە کە دەبێت گرنگی تایبەتی پێبدەین. لانی کەم لەسەدا دەی هەموو چەکدارەکانی ئەلقاعیدە، بە شێوەیەکی جیهانی کار دەکەن، نەك لە وڵاتێکی دیاریکراودا، ئەوانەن کە هەڵگەڕاوەن، وە لە فەرەنسا ڕێژەکە بۆ لەسەدا بیست یان بیست و پێنج بەرز دەبێتەوە. بۆیە ڕاستییەکە ئەوەیە کە قاعیدە ڕێکخراوێکی ئیسلامییە، کە

ژمارەیەکی زۆر لە ئەندامی هەڵگەراوەی هەیە، وا پیشان دەدەن کە قاعیدە ڕێکخراوێکی تەواو ڕادیکاڵ و بە جیهانیکراوە، لەبەرئەوەی ئەندامەکانی بە شێوەیەکی ڕەها پاڵنەری کەلتوریان لەسەر نییە و گرنگی بە کەلتور نادەن. ئەوان مۆتیڤی ژیانی سیاسی ولاّتەکەیان کاریگەری لەسەریان نییە. پاڵنەری سەرەکی ئەوان پەیوەندییانە بە جیهادی نێونەتەوەییەوە. ڕۆژێك ئەوان دەچن بۆ بۆسنە و ڕۆژێکی تر بۆ چیچان یان کشمیر، دەچن بۆ ئەفغانستان یاخود ڕوو دەکەنە فەلوجە لە عێراق. ژمارەیەکی زۆر کەمی ئەوان ڕوو دەکەنە فەلەستین، ژمارەیەکی زۆر زۆر کەم. بۆیە ئێمە لەبەردەم ئەو جیهادیستە نێونەتەوەییانەداین کە بەجۆرێك لە جۆرەکان لە سەفەردان، لە جیهادەوە دەڕۆن بۆ جیهاد، لە جیهانێکدا ژیان دەگوزەرێنن کە هێندەی بە زمانی ئینگلیزی قسە دەکەن، بە عەرەبی یان فارسی قسە ناکەن، خواردنی خێرای خۆرئاوایی دەخۆن و دەڕۆن بۆ ئوتێلە گەورەکان، وە چەندین شتی لەوبابەتە. ئەوان نمونەیەکی پێرفێکتن بۆ گەشتیارانی سەردەمی مۆدێرن.

کریسلەر:

تۆ باسی ئەوە دەکەی کە جیاوازی هەیە لە تێگەیشتن بۆ جیهاد کە زۆر گرنگە، لەبەرئەوەی بۆ ئەوان جیهاد ململانێیەکی تاکەکەسییە وەك هەوڵێك بۆ بەربەرەکانێکردن لە کۆمەڵگەیەکی دیاریکراودا.

ئۆلیڤەر ڕوا:

بەڵێ. لە تێنەگەیشتنێکی نەریتی لە یاسای موسوڵمان، جیهاد

دەتوانرێت لە ئەتمۆسفێرگەلێکی دیاریکراودا ئەنجام بدرێت. ئەو هەرێمەی کە جیهادی تێدا ئەنجام دەدرێت دەبێت دیاری بکرێت. تۆ جیهاد لە هەرێمێکی دیاریکراودا دەکەیت، بۆیە پێویستە جیهاد لە ژێر فەرمانی سەرکردەگەلێکی سیاسی و ئاییندا ئەنجام بدەیت، ئەوە بەرپرسیارێتییەکی دەستەجەمعییە. ئەوە بەو مانایە دێت ئەگەر خەڵکانی تر جیهاد بکەن تۆ وەك کەسێك ناچار نیت بەشداری بکەیت. ئەم نەوە نوێیە، ئەم کارەکتەرە رادیکاڵانە، جیهاد بە شێوەیەکی تر ئەنجام دەدەن. یەکەم: ئەوان دەڵێن دەبێت هەموو کەس بچێت بۆ جیهاد، ئەوان پێیانوایە جیهاد هێندەی وەزیفەیەکی تاکەکەسییە، ئەوەندە دەستەجەمعی نییە. دووەم: ئێمە لە سەردەمی جیهادێکی جێگیرداین. سێیەم: جیهاد فۆرمێکی جیهانی وەرگرتووە و لە هەرێمێکی دیاریکراودا ئەنجام نادرێت.

بۆیە لە سایەی ئەم پێناسەیەی جیهاددا، بیانییەکانی ئەلقاعیدە فەلەستین جێدەهێڵن و رووودەکەنە ئەفغانستان. دەتوانم بڵێم بۆ موسوڵمانە باوەردارەکان، فەلەستین، بنکەیەکی ترادسیۆناڵە بۆ جیهاد. فەلەستین هەرێمێکی دیاریکراوە و تەنها پەیوەندی بە خەڵکی ئەو وڵاتە خۆیانەوە هەیە، کێشەی فەلەستین دەبێت لەسەردەستی رێبەریکردنێکی سیاسی دیاریکراوەوە چارەسەر بکرێت، هەرچەندە زۆرێك لە گەنجە موسوڵمانەکان لەگەڵ ئەم رایەدا نین. عەبدول عەززام، بەرپرسی باڵای ئەلقاعیدە، بریاریدا ئەردەن بەرەو ئەفغانستان جێبهێڵێت لەبەرئەوەی ئەوە دەیوت:" جیهاد لە فەلەستین تەواو تەواو سنووردارە و لە سایەی کەسانێکدا ئەنجامدەدرێت، کە موسوڵمانی راستەقینە نین، بۆ نمونە یاسر عەرەفات. ئەوان درەنگ یان زوو

دانوسان دەکەن و ئەگەر دەوڵەتی فەلەستینیان دروستکرد، ئەو دەوڵەتەش هەمان جۆرن لە دەوڵەتە عەرەبییەکانی تر، وەکو میسر و ئەردەن و سوریا. ئێمە گرنگی بەو جۆرە جیهادە نادەین". بۆیە ئەوان بڕیاریاندا لە هەشتاکانی سەدەی ڕابردوودا ڕوو بکەنە ئەفغانستان بۆ بەشداریکردن لە جیهادی نێونەتەوەیی لەگەڵ خەڵکانێك کە لەهەموو سوچێکی جیهاندا دژ بە دوژمنێکی جیهانی کە لەو سەردەمەدا یەکێتی سۆڤیەت بوو. ئەوان گرنگییان بە بنیادنانی دەوڵەتی فەلەستین لە ئەفغانستان نەدەدا. ئەوان لە ڕاستیدا گرنگییان بە ڕزگاربوونی ڕۆحی خۆیان دەدا، لەڕێگەی جیهادکردن وەك وەزیفەیەکی ئایینی نەك دەسەلاتی سیاسی.

# ئەدرێسی تیرۆریزم

کریسلەر:

ئەوە ئاشکرایە کە تیرۆریزم کێشەیەکی سیاسییە وەك ئەوەی کێشەیەکی ئاسایشی نیشتیمانی بێت. بەڵام بەو چەکانەی کە بەکاری دەهێنن، زیاتر وا دەردەکەوێت کە کێشەکە ئاسایشی نەتەوەییە. بەڵام لەراستیدا باشترین رێگا بۆ ئەم کێشەیە سیاسەتێکی ژیرانەیە و هەواڵگرییەکی تەواو بەهێز و هاریکاریکردنێکە لەنێوان هێزە سیاسییەکاندا لە هەموو سوچێکی جیهاندا.

ئۆلیڤەر ڕوا:

بە دڵنیاییەوە. گەورەترین هەڵە وەڵامدانەوەی ڕووداوی یازدەی سێپتەمبەر بوو بە هەڵگیرساندنی جەنگێکی تەقلیدی، بەهۆی ناردنی سوپا بۆ داگیرکردنی ناوچەکە. بەڵام ئەو گەنجە ئیسلامیانە گرنگی بە هەرێمێکی دیاریکراو نادەن. ئەگەر ئەفغانستان لەلایەن هێزەکانی هاوپەیمانانەوە کۆنترۆڵ بکرێت، ئەوان ئەفغانستان جێدەهێڵن و ڕوو دەکەنە پاکستان. ئێمە ئیستا دەتوانین چی بکەین؟

هەر ئەمەشە وا دەکات کە بزانین بۆچی ئەوان ڕوویانکردە عیراق، بۆیە نابێ وادابنێین کە بە شەڕ دژ بە تیرۆریزم کۆتایی بە تیرۆر دێت. یەکەم، وەك ئەوەی کە ئێمە ئیستا دەزانین، هەرگیز پەیوەندییەك لەنێوان گروپی ئەلقاعیدە و سەدام حسێندا نەبووە.

دووەم، عیراق چەکی کۆکوژی و ئەتۆمی نەبوو. بەڵام لەوە گرنگتر، جێگیربوونی هاوپەیمانانە لە عیراق. بێگومان لەم ڕێگەیەوە عیراق لە دیکتاتۆرێکی وەکو سەدام حوسێن ڕزگاریبوو. ئەوە شتێکی باش بوو بۆ ئەوەی وڵاتانی تری عەرەبی بێن بە دیموکراسی، من بەتەواوی دژ بەمە نیم، بەڵام ئەوە کوشتنی کاتە، مەبەستم ئەوەیە کات دەکوژین گەر بمانەوێت بەم شێویە شەڕی تیرۆریزمی جیهانی بکەین.

ئەم شەڕانە، کۆمەکی فراوانبوونی تیرۆریزم دەکات، وە کاریگەرییەکی تەواو نێگەتیڤ دوای خۆی جێدەهێڵێت، لەراستیدا لای خەڵك ئەو ڕاستییە دەرکەوتووە کە خۆرئاوا لاوازە، خۆرئاوا ناتوانێ لە شەڕێکی لۆکاڵی زیاتر چیدی بکات، ئەمەش بۆ سوپای خۆرئاوا

و بەتایبەت سوپای ئەمریکا، تەنانەت ناتوانن زاڵبن بەسەر چەند هەزار گەریلایەکی لۆکاڵیدا. کشانەوەی سوپای ئەمریکا لە عیراق وەك شکست بۆ خۆرئاوا دەردەکەوێت، وەك ئەوەی سۆماڵ لە ساڵی ١٩٩٢. بۆیە، تۆ ناتوانی وەڵامی تیرۆریزم بە شەڕ بدەیتەوە. تۆ دەتوانی بە دوو ڕێگە وەڵامی تیرۆریزم بدەیتەوە، وەك ئەوەی تۆ وتت، یەکەم، سیاسەتی هەواڵگری و هاریکاریکردن، دووەمیش بزوتنەوەی سیاسی بۆ گۆشەگیرکردنی تیرۆریستەکان لە خەڵك بەگشتی.

کریسلەر:

لە ئەمریکا مشتومڕ هەیە لەسەر بزوتنەوەی دژە سەربازی. ئێمە گوێمان لە "تۆماس فریدمان"ە دەڵێت:" دەنگی مودێرن لە ئیسلامدا دەبیسترێت". بەبۆچوونی تۆ پێشنیاری سیاسی دەتوانێ ڕێگەچارە بێت؟ ستراتیژێکی عەقلانی لەم نێوەندەدا بەدی دەکرێ؟ من لەبارەی مامەڵەکردن لەگەڵ تیرۆریستەکاندا هیچ ناڵێم، بەڵکو گەرەکمە لەبارەی پەیوەندی خۆرئاوا بە ئیسلامەوە و بۆچوونی تاکەکان لە سەرجەم باوەڕەکاندا و پەیوەندییان بە وانی ترەوە قسە بکەم.

ئۆلیڤەر ڕوا:

یەکەم، دەنگی مۆدێرن لە ئیسلامدا بوونی هەیە، خەڵکانێك هەیە لە ئیسلامدا کە بەتەواوی تیرۆریزم ڕەت دەکەنەوە و دەیانەوێت وەك موسوڵمانێکی لیبراڵ و کراوە دەربکەون. کێشەکە لەوەدایە تیرۆریستان خەڵکانێکی دیاریکراو نین. ئەوان هاووڵاتییان هەیە. ئەوان پێویستیان بە خەڵکانی جیهانی هەیە. ئەوان ڕەنگە لە عیراق

بژین، ڕەنگە لە سوریا، لە لوبنان، لە فەلەستین لە ئیسرائیل و عەرەبستانی سعودیە و ... هتد بژین. ئەوەی ئەوان دەیبینن، ئەوەیە کە لە شوێنێکی لۆکاڵییەوە، چاو لە خۆرئاوا دەبڕن و وا لە خۆرئاواش دەکەن جیهان لە شەڕی دژ بە تیرۆریزم وەئاگا بهێنێتەوە.

بۆنمونە، ئیستا لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست ململانێ لەئارادایە، بێگومان ململانێ لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا لە ئاییندەشدا هەر دەبێت، بەڵام بنەمای ئەو ململانێیانە هیچ پەیوەندییەکی بە تیرۆریزم یان ئیسلامەوە نییە. زۆرێك لەو ململانێیانە ناسیۆنالیستین. فەلەستینییەکان شەڕ بۆ دەوڵەتی فەلەستین دەکەن، ئەوان هەرگیز شەڕ بۆ دەوڵەتێکی ئیسلامی ناکەن، وە بزوتنەوەی حەماس هەڵبژاردنی بردەوە لەبەر ئەوە نەبوو کە حەماس ئیسلامییە، بەڵکو لەبەرئەوەبوو کە فەلەستینییەکان پێیانوابوو، حەماس لە فەتح باشترە، نەك بۆ ڕوخانی ئیسرائیل، بەڵکو بۆ بەڕێوەبردنی پرۆژەی بیرۆکراسی و کۆمەڵگە.

خۆرئاوا بیر لەم کێشە ناسیۆنالیستیانە ناکاتەوە. ئێمە دەمانەوێت بە هەموو عەرەب بڵێین" بەر لە هەرشت، دەسبەرداری ناسیۆنالیزم بن، بیروبۆچونی خۆرئاوا قبوڵ بکەن، وە دواتر لەگەڵتان دەدوێین". بەڵام ئەوان دەڵێن:" یەکەم با قسە لەسەر کێشە سیاسییەکانمان بکەین، وە دواتر ئێمە لەبارەی بیروباوەڕ و مۆدێرنە و شتی لەو بابەتەوە دیالۆگ دەکەین". لەبەر ئەوە بەهەڵەتێگەیشتنی گەورە لەنێوانماندا هەیە.

زۆرێك لە ڕوناکبیرە عەرەبییەکان، ئیسلامیست و سێکولار و تەنانەت مەسیحییەکانیشیان، بە جۆرێك لە جۆرەکان ناسیۆنالیستن، وە ناسیۆنالیزم زاراوەیەکی خراپە لەو دەوڵەتە عەرەبیانەدا.

نیشتیمانپەروەری زاراوەیەکی دروستە، بەڵام تەنها ئەمریکییەکان، وێنەی نیشتیمانپەروەرییەکی خراپ پیشان دەدەن. نا، هەروەها تیرۆریستەکانیش نیشتمانپەروەرن. ئەوان دەیانەوێت شتێك بۆ وڵات بکەن، جا ئەو شتە باشە یان خراپ، ئەوە شتێکی ترە. ئێمە پێویستە لە کێشەی ئیسلام خۆمان قوتار بکەین، وەك ئەوەی کە کێشەگەلێکی ڕاستەقینەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستە، کە کێشەیەکی ناسیۆنالیستی و ڕەگەزی و تائیفییە.

کریسلەر:

ئۆلیڤەر، دەمــەوێ سوپاست بکەم، بۆ ئەوی لە بەشی دووەمی ئەم چاوپێکەوتنەدا دیسان بەشداریت لەگەڵکردم. من دەمەوێت کتێبەکەت" ئیسلامی بە عەلمانیکراو" بەرز بنرخێنم، کە پڕە لە تەفسیری تایبەت بە ئەم مشتومڕەمان.

ئۆلیڤەر ڕوا:

زۆر سوپاس.

کۆتایی

## لەبەرهەمە چاپراوەکانی وەرگێڕ

١. فەلسەفە و دیالۆگ. کۆمەڵێك چاوپێکەوتن، وەرگێڕان. پـرۆژەی شەست کتێب دەربـارەی پێکهاتە فکرییەکانی دیموکراسی.٢٠٠٦
٢. ئاشنابوون بە فێمینیزم. وەرگێڕان، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ٢٠٠٧.
٣. -راپۆرتەکەی بیکەر-هاملتۆن. وەرگێڕان ،بە هاوبەشی. دەزگای خەندان بۆ پەخش و وەشاندن.٢٠٠٧
٤. فریشتەی سەر تەختەڕەش. کاج هیمیلستراب، شانۆگەری. دەزگای ئاراس.٢٠٠٨.
٥. چەند وێستگەیەکی ئەدەبی. نووسین و وەرگێڕان. پاشکۆی ڕەخنەی چاودێر.٢٠٠٨

